Kurdistan Regional Government
Ministry of Education
G.D. of Curriculum & Printings

٥

حکومەتی هەرێمی کوردستان ـ عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# ڕێزمان و خوێندنەوەی کوردی



## بۆ
## پۆلی پێنجەمی بنەڕەتی

حکوم... ...ان- عیراق

...ه

بەڕێوەبە... ...چاپەمەنییەکان




# ڕێزمان و خوێندنەوەی کوردی

## بـــــۆ

## پۆلی پێنجەمی بنەڕەتی

دانانی

لیژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە

بژارکردنی

سادق ئەحمەد عوسمان ڕوستایی

خەسرۆ عەلی حەسەن    ئیسماعیل محەمەد عەبدوڵڵا

نەمام جەلال ڕەشید

چاپی نۆیـەم    ۱٤۳۷ کۆچی    ۲۰۱٦ زایینی    ۲۷۱٦ کوردی

# پێشەکی

مامۆستای بەڕێز، ئەم پەڕتوکەی  کە لەبەر دەستتدایە لە ئەنجامی هەوڵ و کۆششێکی زۆر بەم شێوەیە دانراوەو ڕێکخراوە و خراوەتە بەر دەستتان.

ئەم پەڕتوکەی جیاوازە لە پەڕتوکەی کوردییەکانی پێشتر لەم پەڕتوکە  بابەتی ڕێزمان و خوێندنەوە کراوە بە یەک پەڕتوک. جا بۆ بەشە وانەکانی زمانی کوردی لە  خوێندنەوە و دارشتن و لەبەرکردن و ڕێنووس و خۆشنووسیدا، هەر بەشەیان لە خزمەت بەشەکانی دیکەدایە و بە هەموویان زمانە شیرینەکەی کوردی پێکدێنن.  بۆیە پێویستە لە دابەشکردنی بەشە وانەکانی زمانی کوردی بەسەر ڕۆژەکانی هەفتەدا هەر لە سەرەتای ساڵەوە گرنگی پێ بدرێت و قوتابییان و خوێندکارانی لێ ئاگادار بکرێنەوە... هیچ بەشێکیان نەکرێتە قوربانیی بەشەکەی دی. ئامانج لەم پەڕتوکانە  ئەوەیە، کە خوێندکاران بتوانن بە زمانێکی کوردی ڕەوان بدوێن و بنووسن و بخوێننەوە و گەشەی پێ بدەن، ئەم ئامانجانە بە هاوکاری هەموو لایەکمان بێتە دی، ئەم پەڕتوکە پێویستییەکی زۆری بە تێبینی و بۆچوون و باری سەرنجی ئێوەی بەڕێزە، بۆیە داواکارین دڵسۆزانە هەڵیسەنگێنن و ڕای خۆتانی لەسەر دەربڕن. ئەگەر هەر تێبینی و کەموکوڕییەک یان هەر شتێکی لەم بارەوە هەبوو بە ڕێگەی پەروەردەکان ئاگادارمان بکەنەوە، بۆ ئەوەی گوڵزاری پەڕتوکەکە لە چاپەکانی داهاتوودا پوختەتر و گەشاوەتر بێت.

هەر سەرکەوتوو بن..

**لیژنەی دانانی پەڕتوکەکە**

# بابەتەکانی بەشی ڕێزمان

# ڕســـتـه

١. خوناو هات.

٢. نازه بۆ هەڵەبجە چوو.

٣. باران باری.

٤. بەفرین نامەی نووسی.

## ڕاڤــە:

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو گوتنانەی لای سەرەوە دەبینین هەر یەکەیان واتایەکی تەواوی خۆی هەیە و لە کۆمەڵە وشەیەک پێکهاتووە، وەک ئاخاوتنی (خوناو هات) لە وشەی (خوناو) و لە وشەی (هات) پێکهاتووە. هەردووکیان پێکەوە واتایەکی تەواویان بە دەستەوە داوە، هەروەها ئاخاوتنەکانی دیکەش بەم شێوەیە لێکدەدرێنەوە، بۆیە پێیان دەگوترێت ڕستە.

## پێناسە:

**ڕستە چەند وشەیەکە پێکەوە واتایەکی تەواو، دەبەخشێت و لەکۆتاییدا بەپێی مەبەست هێمای بۆ دادەنرێت.**

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. کەی بە گوتن دەگوترێت ڕستە؟

٢. ڕستە لە چی پێکهاتووە؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بەم وشانە پڕ بکەوە:

( دەکات – گوڵەکە – هیوا – هەور )

١. ........... جوانە.

٢. نانەوا نان ...........

٣. بەهاران ........... دەگرمێنێت.

٤. ئاشتی ........... ی گەلانە.

## ڕاهێنان (٣)

لەم وشە تێکەڵاوانەی خوارەوە ڕستەی تەواو دروست بکە:

١.(فێردەکات– مامۆستا– قوتابی)

٢.(کوردستانە – شارێکی – کەرکوک)

٣.(دەڕوێت – بەهاران – ڕێواس)

٤.(مەل– هێلانەی– تێک مەدەن)

## ڕاهێنان (٤)

ڕستەکانی ناو ئەم پارچە نووسینەی خوارەوە دەربهێنە:

میللەتی کورد بۆ ڕزگاری شۆڕشی کرد. بۆ گەیشتن بەو ئاواتە شەهیدی دا. دوای ڕاپەڕین هەڵبژاردنی کرد. لە ئەنجامدا، پەرلەمانی دانا. بژی خەباتی کورد. بژی کوردستان. بژی سەربەخۆیی.

### واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| گوتن | ئاخفتن، ئاخاوتن |
| وشە | پەیڤ |
| ئاوات | هیڤی |
| ڕاپەڕین | سەرهەڵدان |

# وشە

١. کاوە چوو بۆ سلێمانی.

٢. کورد بۆ ئازادی تێدەکۆشێت.

٣. منداڵەکە نوست.

٤. گوێزی هەورامان بەدەست دەشکێت.

٥. باڵندە بە باڵێک نافڕێت.

## ڕاڤە:

ڕستەی یەکەم (کاوە چوو بۆ سلێمانی) لە بێژەی (کاوە، چوو، بۆ، سلێمانی) پێکهاتووە، بە هەر یەکێک لەم بێژانە، کە ڕستەکەی لێ پێکهاتووە دەگوترێت (وشە). هەروەها ڕستەکانی دیکەی لای سەرەوە بەم جۆرە لێکدەدرێنەوە.

## پێناسە:

**وشە: بێژەیەکە ڕستەی لێ پێکدێت، وەک: کاوە، کورد، منداڵەکە، بۆ، گوێز، هەورامان، چوو، باڵندە.**

## ڕاهێنان (١)

هەر یەکە لەم ڕستانەی خوارەوە لە چەند وشەیەک پێکهاتووە؟ وشەکان دیار بکە:

١. پێشمەرگە کوردستان دەپارێزێت.

٢. من لەگەڵ باوکم کاردەکەم.

٣. مرۆڤی باش سەردەکەوێت.

٤. لەناو ئاوی لێڵ مەلەمەکە.

٥. گوڵی شلێر لە کوردستان دەڕوێت.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانە بەم وشانەی خوارەوە پڕ بکەوە:

(چۆلەکە، دەرچوو، بادینان، بە، لێڵ)

١. ڤیانی خوشکم بە یەکەم ............ .

٢. ئاوی ............ مەخۆوە .

٣. باوکم بۆ ناوچەی ............ دەچێت.

٤. داری ئازادی ............ خوێن ئاو دەدرێت.

٥. ............ باڵندەیەکی جوانە.

## ڕاهێنان (٣)

پێچەوانەی ئەم وشانەی خوارەوە بنووسە:

(سارد، ڕوناکی، کورت، شیرین، دوور)

## ڕاهێنان (٤)

لەم کۆمەڵە وشە تێکەڵاوانەی خوارەوە ڕستەی تەواو دروست بکە:

١.(دەچێت، بۆ، ئازاد، قوتابخانە)

٢.(دەکڕێت، نەسرین، گوڵ)

٣.(باخچە، ئاو دەدات، فەرهاد)

٤.(موڕەبا، لە، دروستدەکرێت، هەنجیر)

### واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| وشە | پەیڤ |
| تێدەکۆشێت | خەبات دەکات |
| باڵ | چەنگ |
| بەیانی | سوباهی، سبەینێ، سبەی |
| لێڵ | شێلی، شێلو، شلوێ |
| باخەوان | ڕەزڤان، ڕەزوان |
| هەنجیر | هژیر |

# جۆرەکانی وشە لەڕووی داڕشتنەوە

## وشەی سادە- وشەی ناسادە

| کۆمەڵەی ١ | کۆمەڵەی ٢ |
|---|---|
| وشەی سادە | وشەی ناسادە |
| خامە | پیرەمێرد |
| چالاک | نەورۆز |
| نەوت | کرێکار |
| سەفین | دەرهێنان |
| چیا | پیرەمەگروون |
| بەرز | کوهدار |
| بۆن | نازدار |

**ڕاڤە:**

ئەگەر بڕوانینە وشەکانی لای سەرەوە، دەبینین، لە کۆمەڵەی (١) و لە کۆمەڵەی (٢) پێکهاتووە.

لە کۆمەڵەی (١)دا وشەی:

خامە: وشەیەکی سادەیە، چونکە لە یەک بێژە پێکهاتووە.

چالاک: وشەیەکی سادەیە، چونکە لە یەک بێژە پێکهاتووە.

نەوت: وشەیەکی سادەیە، چونکە لە یەک بێژە پێکهاتووە.

سەفین: وشەیەکی سادەیە، چونکە لە یەک بێژە پێکهاتووە.

چیا: وشەیەکی سادەیە، چونکە لە یەک بێژە پێکهاتووە.

بەرز: وشەیەکی سادەیە، چونکە لە یەک بڕگە پێکهاتووە.

بۆن: وشەیەکی سادەیە، چونکە لە یەک بڕگە پێکهاتووە.

لە کۆمەڵەی (٢) دا وشەی:

پیرەمێرد: وشەیەکی ناسادەیە/ سێ بڕگەیە (پیر+ ە+ مێرد).

نەورۆز: وشەیەکی ناسادەیە/ دوو بڕگەیە (نەو+ رۆز).

کرێکار: وشەیەکی ناسادەیە/ دوو بڕگەیە (کرێ+ کار).

دەرهێنان: وشەیەکی ناسادەیە/ دوو بڕگەیە (دەر+ هێنان).

پیرەمەگروون: وشەیەکی ناسادەیە/ سێ بڕگەیە (پیر+ ە+ مەگروون).

گوهدار: وشەیەکی ناسادەیە/ دوو بڕگەیە (گوهـ+ دار).

نازدار: وشەیەکی ناسادەیە/ دوو بڕگەیە (ناز+ دار).

## پێناسە:

**وشە لە ڕووی دارشتنەوە دوو جۆرە:**

1. **وشەی سادە: وشەیەکە لە یەک بڕگە پێکهاتووە، وەک: وشەی (خامە، چالاک، نەوت، چیا، بەرز، بۆن).**
2. **وشەی ناسادە: وشەیەکە لە بڕگەیەک زیاتر پێکهاتووە، وەک: وشەی (پیرەمێرد، نەورۆز، کرێکار، دەرهێنان، پیرەمەگروون، گوهدار، نازدار).**

## ڕاهێنان (١)

وشەی سادە لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١. هەولێر پایتەختی کوردستانە.

٢. خوێندکاری کورد باش دەخوێنێت.

٣. سەرچل نامە بۆ دایکی دەنووسێت.

٤. کاوە و کارزان بۆ ئەشکەوتەکەی هەزارمێرد چوون.

٥. سەرچنار دەکەوێتە پارێزگای سلێمانی.

## ڕاهێنان (٢)

هەر یەک لەم وشە ناسادانەی خوارەوە بکە بە وشەی سادە:

(سەرگوڵ، چاوشین، شاهەنگ، دوودڵ، دوارۆژ)

## ڕاهێنان (٣)

ئەم بۆشاییانە بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە پڕ بکەوە:

(ماسی، لاولاو، سۆلاڤ، گەرمکردن، بێکەس)

١. تاڤگەی ............ لە ئامێدییە.

٢. ............ بەبێ ئاو ناژی.

٣. بەفر بە ............ دەتوێتەوە.

٤. ............ لە دار ئالاوە.

٥. ............ شاعیرەکی مەزنی کوردە.

## ڕاهێنان (٤)

سەر+ دار = سەردار

تۆش ئەمانەی خوارەوە وەک نمونەی سەرەوە لێبکە.

١. کڕ+ یار ..............

٢. فرۆش + یار ..............

٣. ئاسن + گەر ..............

٤. سەر+ تاش ..............

## ڕاهێنان (٥)

وشەی سادەی ( چاو ) پێنج جار بەکاربهێنە لە دروستکردنی وشەی ناسادە.

# بڕگە

١. کورد

٢. کوردستان		کور/ دس / تان.

٣. گوڵ

٤. گوڵزار		گوڵ/ زار

٥. باب

٦. باپیر		با / پیر

٧. مێرووله		مێ/ روو/ له

**ڕاڤە:**

ئەگەر سەرنج بدەینە وشەکانی سەرەوە دەبینین وشەی (کورد) تەنها لە یەک‌بڕگە پێکهاتووە چونکە بە یەکجار دەگوترێت، وشەی (کوردستان) لە سێ بڕگە پێکهاتووە کە (کور، دس، تان) چونکە بە سێ جار لە زار دێتە دەرەوە و هەروەها وشەکانی دیکەش لە بڕگە پێکهاتوون.

**پێناسە:** **بڕگە ئەو پارچە وشەیە، کە بە یەکجار لە زار دێتە دەرەوە.**

## ڕاهێنان (١)

ئەم بڕگانەی خوارەوە وشە دروست بکە:

١. شا / سوار

٢. قو / تاب / خا / نە

٣. ئا / هەنگ

٤. کەر / کوک

٥. ئا/ زا/ دی

## ڕاهێنان (٢)

ئەم وشانەی خوارەوە بڕگە بکە:

(هەرمێ، دڵدار، شاتوو، چاوکاڵ، مێرگەسۆر)

## ڕاهێنان (٣)

مامۆستا داوا لە خوێندکاران دەکات هەر یەکە ناوی خۆی بڕگە بکات.

# پیت

**پیت:** وێنەی ئەو دەنگانەیە کە لە زار دێنە دەرەوە گوتنیان لێ پێکدێت و بچووکترین دانەی نووسینە لە زماندا و لەوە زیاتر ناتوانرێت ورد بکرێتەوە.

**ئـ - پیتی بزوێن[1]**

| | |
|---|---|
| ١. | ا |
| ٢. | ە |
| ٣. | ی |
| ٤. | ێ |
| ٥. | و |
| ٦. | وو |
| ٧. | ۆ |

(ی، ێ) دەبنە — (و) بزوێن و نەبزوێن

**ب- پیتی نەبزوێن**

ئـ، ب، پ، ت
ج، چ، ح، خ، د
ر، ڕ، ز، ژ، س
ش، ع، غ، ف، ڤ
ق، کـ ، گ، ل، ڵ
م، ن، هـ (و، ی)[2]

---

1. بزوێنێکی زۆر کورت هەیە کە بەم پیتانە وێنەی بۆ دانەنراوە بەڵام بە پیتی لاتینی نیشانەی (i) بۆ دانراوە وەك لە وشەی (birdin) یان (jin) یان (diî).

2. پیتە بزوێنی (و - ی) لەناو وشەدا هەندێك جار دەبنە پیتی نەبزوێن‌و هەندێك جاریش دەبنە بزوێن، ئینجا بۆ جیاکردنەوەی پیتی ( و - ی) ی نەبزوێن لە پیتی (و - ی)ی بزوێن پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین:

- پیتە (و - ی) کەوتە نێوان دوو پیتی نەبزوێن ئەوا ئەم (و - ی)یە دەبنە پیتی بزوێن وەك: (کورد، شیر) لێرەدا بزوێنن.
- هەر کاتێك لە پێش یان لە پاش پیتی (و - ی) پیتێکی بزوێن هەبێت ئەوا بێگومان ئەم (و - ی)یە دەبنە پیتی نەبزوێن، وەك: (داو، وار، دیار، دایك)
- هەمیشە دوو پیتی بزوێن لە زمانی کوردی بە دوای یەک نایەن، واتە (بە تەنیشت یەکەوە نابن) وەک: (سێو، پیاو، یانە، یاری).

**ڕاڤە:**

١. **پیتـــی بزوێن:** ئەو پیتانەن، کە دەنگدارن و یارمەتی پیتە نەبزوێنەکان دەدەن لەکاتی دەربڕینیاندا.

٢. **پیتـــی نەبزوێن:** ئەو پیتانەن، کە بەبێ یارمەتیی پیتی بزوێن دەنگەکانیان بە ئاسانی لە دەمەوە نایەتە دەرەوە.

## ڕاهێنان (١)

ئەم وشانەی خـوارەوە هەڵبوەشـێنەوە وبزانـە هـەر یەکـەیان لـە چـەند پیـت پێکهاتوون؟

١. ئازادی (ئـ، ا، ز، ا، د، ی)

٢. هەیڤ ( )

٣. پەنیر ( )

٤. جۆزەردان ( )

٥. کەلار ( )

## ڕاهێنان (٢)

لەناو پیتـەکانی زمـانی کوردیدا چـەند پیـت هەیـە نیـشانەی ( ٧ ) وەربگرێـت، بیاننووسە.

## ڕاهێنان (٣)

ئەم پیتانەی خوارەوە بدە دەم یەکترییەوە و بزانە چ وشەیەکیان لێ دروست دەبێت؟

١. (پ، ە، ر، ل، ە، م، ا، ن)=

٢. (ن، ا، ل، ی ) =

٣. (ڕ، ە، ش، ە، ب، ا) =

٤. (د، هـ، ۆ، ک) =

٥. (خ، ا، و، ێ، ن) =

## ڕاهێنان (٤)

پیتە بزوێنەکانی ناو ئەم وشانەی خوارەوە دەربهێنە:

(گۆڤەند، شێر ، بەڕوو، بێریڤان)

## ڕاهێنان (٥)

١. پێنج وشە بهێنە پیتە بزوێنی (ۆ)ی تێدابێت.

٢. پێنج وشە بهێنە پیتە بزوێنی (ێ)ی تێدابێت.

٣. پێنج وشە بهێنە پیتە بزوێنی (وو)ی تێدابێت.

## جۆرەکانی وشە

**وشە:**

وشە لە ڕووی ڕێزمانەوە، ئەم جۆرانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١. **چاوگ:** گریان، فرۆشتن، خوێندن، چوون، کڕین.

٢. **کار:** برژا، فرۆشت، خوێند...

٣. **ناو:** شاخ، شار، زانا، مەڕ...

٤. **جێناو:** من، تۆ، ئەوان ...

٥. **هاوەڵناو:** جوان، پاک...

٦. **هاوەڵکار:** دوێنێ، لەژێر...

٧. **ئامراز:** بە، لە، بۆ ...

# چاوگ

گریان

فڕین

خوێندن

فرۆشتن

چوون

**ڕاڤە:**

ئەگەر سەرنج بدەینە وشەکانی (گریان، فڕین، خوێندن، فرۆشتن، چوون) هەر یەکەیان مانایەکی سەربەخۆی هەیە، هەروەها لە شوێنی خۆیان ڕوودانێک یا کردەوەیەک دەردەخات، بەڵام نەدراوەتە پاڵ کەسێک یا شتێک و کاتی تێدا نییە، بەم جۆرە وشانە دەگوترێت چاوگ.

**پێناسە:**

چاوگ وشەیەکە ڕوودانێک یا کردەوەیەک نیشان دەدات بەڵام ئەم کردەوەیە نەخراوەتە پاڵ کەسێک یا شتێک کاتیشی تێدا نییە. بە پیتی (ن) کۆتایی دێت.

## تێبینی/

ئـ- نیشانەکانی چاوگ ئەمانەن (ا، یـ، د، ت، وو) .

ب- جۆرەکانی چاوگ پێنجن:

١. چاوگی ئەلفی:(گریان ـ سووتان)

٢. چاوگی یائی:(کڕین – فڕین)

٣. چاوگی دالی:(خوێندن – بردن)

٤. چاوگی تائی:(فرۆشتن – گرتن)

٥. چاوگی واوی:(چوون- دروون)

## ڕاهێنان (١)

جۆری ئەم چاوگانەی خوارەوە دیار بکە:

( کەوتن – خواردن- چوون- سووتان- کڕین )

## ڕاهێنان (٢)

بۆ هەر جۆرێک لە جۆرەکانی چاوگ دوو نمونە بهێنەوە.

# کار

**١. منداڵەکە گریا.**

**٢. دانا کۆمپیوتەرەکەی فرۆشت.**

**٣. ئازاد وانەکەی خوێند.**

**٤. سەیران چوو بۆ بازاڕ.**

**٥. چرۆ ملوانەکەیەکی کڕی.**

## ڕاڤە:

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی لای سەرەوە دەبینین:

١. لە ڕستەی (منداڵەکە گریا)دا وشەی (گریا) کارە و لە کاتی ڕابوردوودا ڕوویداوە و لە چاوگی گریان وەرگیراوە.

٢. لە ڕستەی (دانا کۆمپیوتەرەکەی فرۆشت)دا وشەی (فرۆشت) کارە و لەکاتی ڕابوردوودا ڕوویداوە و لە چاوگی فرۆشتن وەرگیراوە.

٣. لە ڕستەی (ئازاد وانەکەی خوێند) وشەی (خوێند) کارە ولەکاتی ڕابردوو ڕوویداوە ولە چاوگی خوێندن وەرگیراوە.

٤. لە ڕستەی (سەیران چوو بۆ بازاڕ) وشەی (چوو) کارە ولەکاتی ڕابردوو ڕوویداوە ولە چاوگی چوون وەرگیراوە.

٥. لە ڕستەی (چرۆ ملوانکەیەکی کڕی) وشەی (کڕی) کارە ولەکاتی ڕابردوودا ڕوویداوە ولە چاوگی کڕین وەرگیراوە.

## پێناسە:

**کار: وشەیەکە کردەوەیەک دەداتە پاڵ کەسێک یان شتێک لە تافێکی دیاریکراودا.**

## ڕاهێنان (١)

کارەکانی ئەم ڕستانەی خوارەوە دەربهێنە:

١. زانا کتێبێکی کڕی.

٢. شوان چوو بۆ دهۆک.

٣. تارا نامەکەی نارد.

٤. پشیلەکە ماستەکەی خوارد.

٥. باران باری.

* مامۆستای بەڕێز: لە پۆلی پێنجەمی بنەڕەتی تەنها باسی کاری ڕابردووی (نزیك)مان کردووە.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە یەکێک لەم کارانە پڕ بکەوە:

( نیشت، نوست، چوو، باری )

١. منداڵەکە ............ .

٢. بێریڤان ............ بۆ بازاڕ .

٣. پەپوولەکە لەسەر گوڵەکە ............ .

٤. بەفر ............ .

## ڕاهێنان (٣)

ئەم کارانەی خوارەوە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(سڕی، هێنا، چوو، گرت، کرد )

### واتای وشەکان

| وشە | واتا |
| --- | --- |
| کۆچی دوایی کرد | مرد |
| پەپوولە | پەلاتینک |
| سڕی | پاکژکر |

# ناو

١. **شێرکۆ نوست.**

٢. **بەرخەکەم فرۆشت.**

٣. **هەنارەکەم خوارد.**

٤. **من لە کەلار بووم.**

٥. **دەرگای ژوورەکەم داخست.**

**ڕاڤە:**

ئەگەر بڕوانینە ڕستەکانی سەرەوە، دەبینین:

(شێرکۆ، بەرخەکەم، هەنارەکەم، کەلار، دەرگا) ناون، لە ڕستەی (شێرکۆ نوست)دا وشەی (شێرکۆ) پێی دەگوترێت (ناو)، چونکە بۆ ناولێنانی (کەسێک) بەکارهاتووە.

لە ڕستەی (بەرخەکەم فرۆشت)دا وشەی (بەرخەکە) پێی دەگوترێت (ناو)، چونکە بۆ ناولێنانی (گیانلەبەرێک) بەکارهێنراوە.

لە ڕستەی (هەنارەکەم خوارد)دا وشەی (هەنارەکە) پێی دەگوترێت (ناو)، چونکە بۆ ناولێنانی (ڕووەکێک) بەکارهێنراوە.

لە ڕستەی (من لە کەلار بووم)دا وشەی (کەلار) پێی دەگوترێت (ناو)، چونکە بۆ ناولێنانی (شوێنێک) بەکارهێنراوە.

لە ڕستەی (دەرگای ژوورەکەم داخست)دا وشەی (دەرگا) پێی دەگوترێت (ناو) چونکە بۆ ناولێنانی (شتێکی) بێ گیان بەکارهێنراوە.

## پێناسە:

**ناو: وشەیەکە بۆ ناولێنانی ( کەسێک ، گیانلەبەرێک ، ڕووەکێک ، جێیەک یان شتێک) بەکاردەهێنرێت.**

**وەک : شێرکۆ، بەرخ، هەنار، کەلار، پێنووس.**

## ڕاهێنان (١)

لەم ڕستانەی خوارەوە ناوەکان دەربهێنە:

١. شاری سلێمانی جوانە.

٢. هەوار نووست.

٣. دەنووکی مراوی پانە.

٤. من حەز لە هەناری مێخۆش دەکەم.

٥. ڕێڤین چیرۆک دەخوینێتەوە.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانە بەم ناوانەی خوارەوە پڕ بکەوە:

ساوار، کراس، سەیران، هاوڕێ، کەو

١. .......... ی باش لە تەنگانەدا دەردەکەوێت.

٢. دەنگی .......... خۆشە.

٣. بەهاران .......... خۆشە

٤. .......... خواردنێکی بەتامە.

٥. پەری .......... دەدروێت.

## ڕاهێنان (٣)

ئەم ناوانەی خوارەوە بۆچی بەکارهاتوون:

(شێرزاد– مامز– سێو – بەرد – شەقڵاوە)

### واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| گیانلەبەر | گیانەوەر، گیاندار |
| مراوی | وەردەک |
| دەسورێتەوە | دزفرێت |
| مامز | ئاسک |

**(پێویستە مرۆڤ وتەی چاک، کردەوەی چاک، بیری چاک بێت)**

**(زەردەشت)**

# ناوی تاک - ناوی کۆ

| تاک<br>١ | کۆ<br>٢ |
|---|---|
| کچ | کچان |
| باخ | باخان |
| ماڵ | ماڵان |
| شار | شاران |
| کوڕ | کوڕان |
| بەرد | بەردان |

**ڕاڤە:**

ئەگەر سەرنج بدەینە شەکانی کۆمەڵەی یەکەم (کچ، باخ، ماڵ، شار، کوڕ، بەرد) دەبینین هەموویان ناون و هەر یەکەیان تاکێک پێشان دەدەن، بۆیە پێیان دەگوترێت (ناوی تاک). بەڵام ئەگەر سەرنج بدەینە وشەکانی کۆمەڵەی دووەم (کچان، باخان، ماڵان، شاران، کوڕان، بەردان) دەبینین هەر هەموویان ناون و لە تاکێک زیاتر پیشان دەدەن، بۆیە پێیان دەگوترێت (ناوی کۆ) بۆ گۆڕینی (ناوی تاک) بۆ (ناوی کۆ) نیشانەی ( ان) دەخرێتە سەر ناوەکە.

## پێناسە:*

**ناو لە ڕووی ژمارەوە لە زمانی کوردیدا دوو جۆرە:**

١. **ناوی تاک:** ئەو ناوەیە کە تاکێک پیشان دەدات، وەک:
منداڵ، بەهار، کۆتر. . . هتد.

٢. **ناوی کۆ:** ئەو ناوەیە، کە لە تاکێک پتر پیشان دەدات، وەک:
منداڵان، بەهاران، کۆتران. . . هتد.

## ڕاهێنان (١)

ئەم ناوە تاکانەی خوارەوە بکە بە ناوی کۆ:

(بەرخ، دیوار، گوڵ، بەرد، ژن)

## ڕاهێنان (٢)

لەم ڕستانەی خوارەوە ناوەکان دەربهێنە و جۆرەکەی دیاریکە:

١. منداڵان یاری دەکەن.

٢. مامۆستا هات.

٣. باوکان ئامۆژگاریمان دەکەن.

٤. کوڕی من باش دەخوێنێت.

## ڕاهێنان (٣)

ئەم ناوە کۆیانەی خوارەوە بکە بە ناوی تاک:

(شاخان، نوسەران، باوکان، گوندان، شاران)

---

* مامۆستای بەڕێز بەدرێژی باسی کۆکردنەوەی ناومان نەکردووە لە پۆلەکانی داهاتوو باسیان دەکەین.

# ناوی نەناسراو - ناوی ناسراو

| ١<br>ناوی نەناسراو | ٢<br>ناوی ناسراو |
|---|---|
| نان | نانەکە |
| ژوور | ژوورەکە |
| پەز | پەزەکە |
| ماڵ | ماڵەکە |
| کەروێشک | کەروێشکەکە |

**ڕاقە:**

ئەگەر سەرنج بدەینە وشەکانی کۆمەڵەی یەکەم هەموویان ناوی تاکی نەناسراون وەک (نان، ژوور، پەز، ماڵ، کەروێشک ) ئەم ناوە تاکە نەناسراوانە بەهۆی نیشانەی (ەکە) کراون بەناوی تاکی ناسراو وەک لەژێر کۆمەڵەی دووەم بە دیار دەکەون وەک (نانەکە، ژوورەکە، پەزەکە، ماڵەکە، کەروێشکەکە).

* تەنها باسی ناوی تاکی نەناسراومان کردووە، کە بە ئامرازی ناسینی (ەکە) کراوە بەناوی ناسراو.

**پێناسە:**

ناوی نەناسراو دەکرێتە ناوی ناسراو بەهۆی ئامرازی ناسینی (ەکە).

## ڕاهێنان (١)

ئەم ناوە نەناسراوانە بکە بە ناسراو:

(پەڕتوک، سەپان، مێز، پرتەقاڵ، کرێکار)

## ڕاهێنان (٢)

ئەم ناوە ناسراوانە لە ڕستەدا بەکار بهێنە:

(خۆخەکە، ئەندازیارەکە، پزیشکەکە، پارێزەرەکە، دایکەکە)

## ڕاهێنان (٣)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە ناوێک پڕ بکەوە:

١. ............ بە یەکەم دەرچوو.

٢. چاوم بە ............ کەوت.

٣. مەلەوانەکە لە ............ پەڕییەوە.

# جێناو

## جێناوی کەسی سەربەخۆ:

| کەس | ژمارە | جێناو |
|---|---|---|
| یەکەم<br>دووەم<br>سێیەم | تاک | من<br>تۆ<br>ئەو |
| یەکەم<br>دووەم<br>سێیەم | کۆ | ئێمە<br>ئێوە<br>ئەوان |

## پێناسە

**جێناوی کەسی سەربەخۆ:** ئەو وشەیەیە، کە لەجیاتی ناوێک بەکاردەهێنرێت جا ناوەکە تاک بێت یان کۆ.

**گەردانکردن:**

| | |
|---|---|
| من | هاتم |
| تۆ | هاتیـ (ت) |
| ئەو | هات |
| ئێمە | هاتین |
| ئێوە | هاتن |
| ئەوان | هاتن |

## ڕاهێنان (١)

جێناوی کەسی سەربەخۆ لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١. من ڕێزی ئەو دەگرم.

٢. تۆ کەی هاتیت؟

٣. ئەو مامۆستایە.

٤. ئەوان هاتن بۆ قوتابخانە.

٥. ئێوە ڕۆیشتن بۆ بازاڕ.

٦. ئێمە وانەکەمان نووسییەوە.

## ڕاهێنان (٢)

جێناوی سەربەخۆی تاکو کۆ لە ڕاهێنانی یەکەم جودا بکەرەوەو لەم خشتەیەی خوارەوەدا ڕیزیان بکە.

| کەس | ژمارە | |
|---|---|---|
| | تاک | کۆ |
| کەسی یەکەم | | |
| کەسی دووەم | | |
| کەسی سێیەم | | |

## ڕاهێنان (٣)

ئەم جێناوە کەسییە سەربەخۆیانە بخە ڕستەوە.

(ئەو، ئێمە، تۆ، ئەوان)

## ڕاهێنان (٤)

ئەم بۆشاییانە بە جێناوێکی سەربەخۆ پڕبکەوە:

١- ....... هات.

٢- ........ وانەکەیان خوێند.

٣- ......... پەڕتوکەکەی کڕی.

٤- ........ چووین بۆ مەندەلی.

# هاوەڵناو

١. کۆتری سپی هەڵفڕێنە.

٢. منداڵی زیرەک خۆشەویستە.

٣. سێوی ترش بخۆ.

٤. تۆی ژێر سەردەکەویت.

## ڕاڤە:

لە ڕستەکانی سەرەوەدا وشەی (سپی، زیرەک ، ترش، ژێر) هاوەڵناون، چونکە بە دوای ناو یان جێناودا هاتوون و وەسفی کردوون.

## پێناسە:

**هاوەڵناو وشەیەکە وەسفی ناوێک یان جێناوێک دەکات.**

## ڕاهێنان (١)

هاوەڵناو لەم رستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١. پاڵە بە داسی تیژ کار دەکات.

٢. ئێوەی ژیر دڵسۆزن.

٣. من چیایەکی بڵندم دیت.

٤. ئێمەی ئازا ناترسێین.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم هاوەڵناوانە لەم بۆشاییانەی خوارەوەدا دابنێ:

(جوان، گەرم، گەورە، پاک)

١ . کۆ ڕەوی ............ی کورد دونیای هەژاند.

٢ . گوڵی ............ لێ مەکەوە.

٣ . چێشتی .......... دەم دەسوتێنێت.

٤ . ئاوی ............ بخۆنەوە.

## ڕاهێنان (٣)

پێچەوانەی ئەم هاوەڵناوانەی خوارەوە بنووسە:

(نەرم، ڕەش، خراپ، مەزن، سارد، شیرین، خۆش)

### واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| ژیر | تێگەهشتی ب ئاقل |
| چیا | شاخ، کێو |
| ئازا | بەجەرگ، چاڤ نەترس |
| دەم | دەو، دەڤ، زار |

# هاوەڵکار

**یەکەم**

**١. من پار بە یەکەم دەرچووم.**

**٢. دەرگای خوێندنگە لە هاویندا دادەخرێت.**

**دووەم**

**١. ژاڵە لەژێر کەپرەکەدا نوستبوو.**

**٢. کۆترەکە لەناو هێلانەکە هێلکەی کرد.**

**ڕاڤە:**

سەرنج بدە ڕستەکانی لای سەرەوە، دەبینیت لە:

کۆمەڵەی یەکەم:

لە ڕستەی (من پار بە یەکەم دەرچووم)دا بێژەی (پار) وشەیە و پێی دەگوترێت (هاوەڵکاری کات) چونکە کاتی ڕوودانی کاری (دەرچوونەکە) دیار دەکات.

لە ڕستەی (دەرگای خوێندنگە لە هاویندا دادەخرێت)دا بێژەی (هاوین) وشەیە و پێی دەگوترێت (هاوەڵکاری کات)، چونکە کاتی ڕوودانی کاری (دادەخرێت) دەست نیشان دەکات.

کۆمەڵەی دووەم:

لە ڕستەی (ژاڵە لە ژێر کەپرەکە نووستبوو)دا بێژەی (لەژێر) وشەیە و پێی دەگوترێت (هاوەڵکاری شوێن) چونکە شوێنی ڕوودانی کاری (نوستبوو) دەست نیشان دەکات.

هەروەها لە ڕستەی (کۆترەکە لەناو هێلانەکە هێلکەی کرد)دا بێژەی (لەناو) وشەیە، پێی دەگوترێت (هاوەڵکاری شوێن) چونکە شوێنی ڕوودانی کاری (کرد) دەست نیشان دەکات.

## پێناسە:

**هاوەڵکار* : وشەیەکە کات یان شوێنی ڕوودانی کار لە ڕستەدا دیار دەکات.**

## ڕاهێنان (١)

هاوەڵکار لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١. ڕۆژنامەکانم خستە سەر مێزەکە.

٢. شووتی بە هاوین پێدەگات، بەڵام لیمۆ بە زستان.

٣. خانزاد دوێنێ چوو بۆ دهۆک.

٤. گوڵەکان لەناو گوڵدانەکە دابنێ.

* تەنها باسی هاوەڵکاری کاتی و شوێنی کراوە.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە هاوەڵکارێک پڕ بکەوە:

١. مەلەوانەکە لە ............ ڕووبارەکە مەلە دەکات.

٢. سێ ............ لە هاوینەهەواری سەرسەنگ بووین.

٣. ئەم ساڵ فەرهاد زیرەکترە لە ............

٤. گیا لە ............ بنجی خۆی دەڕوێت.

## ڕاهێنان (٣)

ئەم هاوەڵکارانەی خوارەوە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(پێنجشەممە، دوور، پێرار، تەنیشت)

### لێکدانەوەی وشەکان

| وشە | واتا |
| --- | --- |
| هاوەڵکار | ئاوەڵکار/ ئاوەڵفرمان/ هەڤاڵکار |
| شوتی | شفتی، زەبەش |
| بنج | بن، ڕپن |

# ئامرازی پەیوەندی

١. ئاسکە دەستی بە سابوون دەشوات.

٢. نارین لە باخچە یاری دەکات.

٣. هەژار بۆ هەولێر دەچێت.

## ڕاڤە:

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی لای سەرەوە دەبینین:

لە ڕستەی یەکەمدا (بە) بریتییە لە ئامرازی پەیوەندی، وشەی (سابوون) دەخاتە ناو ڕستەکەوە.

لە ڕستەی دووەمدا (لە) بریتییە لە ئامرازی پەیوەندی، وشەی (باخچە) دەخاتە ناو ڕستەکەوە.

لە ڕستەی سێیەمدا (بۆ) بریتییە لە ئامرازی پەیوەندی، وشەی (هەولێر) دەخاتە ناو ڕستەکەوە.

## پێناسە:

**ئامرازی پەیوەندی:** بێژەیەکە بۆ دروستکردنی پەیوەندی لە ڕستەدا بەکاردێت.

## ڕاهێنان (١)

ئامراز لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١. لاوژ لە کەرکوک دەخوێنێت.

٢. چەپڵە بە یەک دەست لێ نادرێت.

٣. من لە سلێمانی هاتووم.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم ئامرازانەی خوارەوە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(بۆ _ بە _ لە)

## ڕاهێنان (٣)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە ئامرازێک پڕ بکەوە:

١. هەور ............ هەڵم پەیدا دەبێت.

٢. هاژە وانەکەی ............ خامە دەنووسێت.

٣. نەسرین............ دهۆک دەژی.

# بنچینەکانی ڕستە

**( بکەر)- ( کار )**

**ڕستە**



**کۆمەڵەی ناو    کۆمەڵەی کار**

 

**بکەر    کار**

١. ئاراس هات.

٢. نەسرین خەوت.

٣. من ستران دەبیستم.

٤. ڕێباز نامە دەنووسێت.

**ڕستە**



**کۆمەڵەی ناو    کۆمەڵەی کار**

 

**بکەر    کار**

 

**ئاراس    هات**

## ڕاڤە:

لە ڕستەی (ئاراس هات) ، (ئاراس) بەر کۆمەڵەی ناو کەوتووە و دەوری بکەری ڕستەی گێڕاوە، چونکە کاری (هاتن)ی بە ئەنجام گەیاندووە و وشەی (هات) بەر کۆمەڵەی کار دەکەوێت و کارە، چونکە کردەوەیەک لە کاتێکی دیاریکراودا دەردەخات، هەروەها ڕستەکانی دیکە بە هەمان شێوە ڕاڤە دەکرێن.

## پێناسە:

١. **ڕستە:** **بریتییە لە کۆمەڵە وشەیەک پێکەوە واتایەکی تەواو دەدەن و لە دوو کۆمەڵەی سەرەکی پێک دێت.**

٢. **کۆمەڵەی ناو:** **بریتییە لە وشەیەک یان کۆمەڵە وشەیەک ، کە لە سەرەتای ڕستەدا دێت، کارێک دەکات، یان کارێکی دەدرێتە پاڵ. وشەی سەرەکی لە کۆمەڵەی ناو بکەرە.**

**کۆمەڵەی کار:** **وشەیەکە یان کۆمەڵە وشەیەکە کردەوەیەک دەداتە پاڵ کۆمەڵەی ناو لە کاتێکی دیاریکراودا. کار وشەی سەرەکییە لە کۆمەڵەی کار، وەك: (هات، خەوت، دەبیستم، دەنووسێت).**

## ڕاهێنان (١)

بکەر لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١. جووتیار ڕەنج دەدات.

٢. فەرهاد دیارییەکی کڕی.

٣. مێشوولە نەخۆشی بڵاودەکاتەوە.

٤. مامۆستا خوێندکاری ڕاستگۆی خۆش دەوێت.

## ڕاهێنان (٢)

کار لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١. خانی مەم وزینی نووسیوە.

٢. کوردستان بە ئێوە پێشدەکەوێت.

٣. من لەناو باخەکە کارم دەکرد.

٤. ئارووەکەم خوارد.

## ڕاهێنان (٣)

ڕستەی تەواو لەم گوتنانەی خوارەوە دیاری بکە:

١. هەولێر بە قەڵاکەی

٢. پرشنگ تۆوی گوڵ دەچێنێت.

٣. زەویی باش بەرهەمی باش دەدات.

٤. ئەوی شارەزا

٥. بەفر لە زستان

## ڕاهێنان (٤)

ئەم وشانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(سمکۆ، نووسی، ئەو، داخست، دەدوێت)

### واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| ئاروو | هاروێ، خیار |
| مێشووله | پێشکە، پێشوی |
| خانی | هۆزانڤانەکی کوردە |
| دەدوێت | قسە دەکات، دئاخڤیت. |

# خۆشەویستی دایک و باوک



ئەگەر بیر لەو ڕەنج وئەرکانە بکەیتەوە، کە دایک و باوکت لەگەڵیان کێشاویت، دەبێت خۆشەویستیی خۆتیان لەپێش هەموو کەسێکی دیکە پێ ببەخشیت. چونکە دایک لە پێناوی تۆ خۆی دەڕەنجێنێت و سۆزی خۆیت بەسەر دەبارێنێت و چاودێریت دەکات. ئەوەی دایک لەگەڵ منداڵی خۆیدا دەیکات، کەسی دیکە نایکات.

بەیانیان زوو بە زمانێکی شیرین لەخەوت هەڵدەستێنێت، دەستی دەهێنێت بە سەرتداو جلەکانت لەبەر دەکات، خواردنت بۆ ئامادە دەکات، بۆ خێر وخۆشی تۆ هەرچی پێویست بێت و لە توانایدا بێت، دریغی ناکات.

ئەگەر خوانەخواستە نەخۆش بکەویت و شوێنێکت بێتە ژان و ئازار، ئارامی لا نامێنێت و شەو تا بەیانی خەو ناچێتە چاوەکانی، پەستی پەژارە دایدەگرێت، تا چاک دەبیتەوە.
باوکیشت وەک دایکت لە پێناوی تۆدا بە گەرما و سەرما هەوڵ دەدات، ڕەنجدەدات، گوێ بە ماندووبوون و ئێش و ئازار نادات، بە دڵێکی فراوانەوە هەموو ڕۆژێک لە ماڵ دێتەدەر، دەست بە کارکردن دەکات، تا بژێوی منداڵەکانی دابین بکات، چونکە لە گلێنەی چاوی خۆشتر دەوێن، کە دایک و باوکی تۆ بەم شێوەیە بن، دەبێت تۆش دایک و باوکی خۆت خۆش بوێت، ڕێزیان لێ بگریت، بە گوێیان بکەیت و پاداشتیان بدەیتەوە.
پێویستە لەگەڵیاندا هێمن بیت و دڵنەواییان بکەیت، کارێک ، کە پێت دەسپێرن بە خۆشی ئەنجامی بدەیت هەوڵبدەیت کە گلەییان لە تۆ نەبێت، چونکە هەرچییان بۆ بکەیت و چەند بە دەم فەرمانەکانیانەوە بچیت، دەیەکی ئەو ڕەنج و شەونخوونییانە نابێت، کە لەگەڵ تۆدا کێشاویانە.
کە چوونە تەمەنەوە و پیربوون، نابێت فەرامۆشیان بکەیت و دەبێت دەستی ڕێزیان بۆ بەسینگەوە بگریت و خۆشەویستی و ڕەزامەندییان بخەرە پێش چاوی خۆت، وا نەکەیت دڵیان گەرد بگرێت.

## واتای وشەکان

| وشە | واتاکەی |
|---|---|
| دڵنەوایی | : دڵدانەوەو لاوانەوە |
| فەرامۆش | : پشتگوێخستن، لەبیرچوون |
| درێغی | : کەمتەرخەمی، تەمەڵی |
| گلێنە | : بیلبیلەی چاو، سۆمای چاو |
| ژان | : ئازار |
| ئارام | : خۆڕاگر، دان بە خۆداگرتن |
| بژێوی | : نان پەیداکردن، گوزەران |
| دابین | : مسۆگەر، پەیداکردن. |
| پەژارە | : خەمبار |
| گلەیی | : نارەزایی، گازاندە |
| شەونخونی | : بێداری شەو |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. ئەرکی دایک چییە بەرامبەر تۆی قوتابی؟

٢. ئەرکی باوک چییە بەرامبەر منداڵ؟

٣. چۆن پاداشتی دایک و باوک بدەینەوە؟

# چالاکی

**خوێندکاری ئازیز/ واتای ئەم وشانە بزانە:**

**مام** **خاڵ**

**پلک** **مامۆژن**

**پوور** **خاڵۆژن**

**برازا** **کوڕی برا**

**خوشکەزا** **خوارزا**

**پسمام** **ئامۆزا (بۆ کچ دۆتمام)**

**داڕشتن : بە یارمەتی مامۆستا چەند دێڕێک لەسەر ئەم وتەیەی خوارەوە بنووسە جوانترین شیعر لە سەرانسەری جیهان**

**( لای لایەی دایکانە)**

# کاتم بەفیڕۆ نادەم



چەند ڕۆژێک بوو پشووی هاوین دەستی پێکردبوو... باوەڕ، کە قوتابییەکی زیرەک و گوێڕایەڵ بوو، هەر ڕۆژێک ئەم پشووەی لا بە ساڵێک بوو، چونکە قوتابخانە و هاوڕێکانی زۆر خۆش دەویستن، مامۆستاکانیش باوەڕیان خۆشدەویست.

باوەڕ ئەم ئێوارەیە، کە بەرۆژ لەبەر بێکاری زۆر بێزار بووبوو، زوو چووە سەر جێگەی نووستنی خۆی، بەڵام وەک بڵێی شتێک لە مێشکی بخولێتەوە هەر بیری دەکردەوە و خەوی لێنەدەکەوت... لەپڕ ئامۆژگارییەکەی مامۆستای هاتەوە بیر، یەکسەر لەناو جێگە هەستا و بەپەلە ڕایکردە لای دایکی و پێیگوت: دایە گیان بەیانی بەڵکو زوو بانگم بکەیت.

دایکی بە سەرسامی و گاڵتەوە پێی گوت: ڕۆڵە وا پێدەچێ خەونت دیبێت و لێت تێکچووبێت!! بەیانی بۆچی زوو لە خەو هەڵدەستیت؟ دیارە نازانی پشووە؟!

باوەڕ بە زەردەخەنەوە وەڵامی دایکی دایەوە وگوتی:

دایە گیان نەخەونم دیوە ونەلێم تێکچووە، لە مەودوا هەموو بەیانییەک دەچمە پەڕتووکخانەی گشتی بۆ خۆم پەڕتووک دەخوێنمەوە، ئەمشەو ئامۆژگارییەکەی مامۆستا (گۆران)م هاتەوە یاد، بەر لەوەی ساڵی خوێندن کۆتایی بێت، کە گوتی پشووی هاوین نزیکبۆتەوە، نەکەن کاتتان بەفیڕۆ بدەن، پشووی هاوین بە یارمەتیدانی دایک و باوکتان و گەشتی خۆش و خوێندنەوەی پەڕتوکی بەسوود ببەنەسەر.

دایە گیان هەروەها مامۆستا دەیگوت: ئەگەر لەماڵەوە پەڕتوکخانەتان نەبوو، ئەوا ڕۆژانە سەر لە پەڕتوکخانەی گشتی بدەن، لەوێ پەڕتوک و گۆڤاری تایبەت بە ئێوە دەستدەکەون ولەگەڵ تەمەنی ئێوە دەگونجێن.

دایکی باوەڕ ئافەرینی لێ کرد و پێی گوت:

بەسەرچاوان ڕۆڵەی ئازام، بەڵام چەند ڕۆژێک من خۆم، یان باوکت لەگەڵت دێین، تاکو شارەزا دەبیت.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| گوێڕایەڵ | : گوهدار |
| بێزاربووبوو | : بێ تاقەت ببوو |
| بە پەلە | : بلەز، خێرا |
| هاتەوە یاد | : هاتە بیر، بیرکەوتەوە |
| کۆتایی | : دوماهی |
| بەفیڕۆ بدەن | : لە دەستی بدەن |

## ڕاهێنان (١)

خوێندکاری بەڕێز، ئەم ڕستانەی خوارەوە لە تێنووسەکەت بنووسەوە وئەوجا نیشانەی (✓) بەرامبەر ڕستە ڕاستەکان و نیشانەی (×) بەرامبەر ڕستە هەڵەکانی خوارەوە دابنێ:

١. باوەڕ قوتابخانە و هاوڕێکانی زۆر خۆش دەویستن.

٢. دایکی باوەڕ گوێی نەدایە قسەکانی باوەڕ.

٣. لە پشووی هاوین دەبێت کار بکەین و نابێ کاتمان بەفیڕۆبدەین.

٤. لە پەڕتووکخانەی گشتیدا پەڕتووک و گوڤاری تایبەت بە منداڵان هەیە.

٥. مامۆستاکان (باوەڕ)یان خۆشدەویست چونکە قوتابییەکی زیرەک بوو.

## ڕاهێنان (٢)

وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:

١. بۆچی (باوەڕ) هەر ڕۆژێکی پشووی پێ بە ساڵێک بوو؟

٢. مامۆستا (گۆران) چ ئامۆژگارییەکی دابووە قوتابییەکانی؟

٣. باوەڕ بڕیاری دا هەموو بەیانییەک بچێت بۆ کوێ؟

(وەڵامەکان لە تێنووسەکەتدا بنووسەوە)

## چالاکی (١)

پێچەوانەی ئەم وشانە بنووسە، ئەگەر پێویست بوو، با مامۆستا یارمەتیت بدات:

گوێڕایەڵی .................

زوو .................

بەپەلە .................

کۆتایی دێت .................

ئازا .................

## چالاکی (٢)

مامۆستای بەڕێز، پۆلەکە بکە بە سێ دەستە، دەستەکان با لەناو خۆیاندا گفتوگۆ لەسەر چۆنیەتیی بەسەربردنی پشووی هاوین بکەن، پاشان با هەر دەستەیەک بۆ ماوەی پێنج خولەک لەبەردەم دوو دەستەکەی دی باس لە بەسەربردنی پشووی هاوین بکات.

# خوێندەواری

خوێندەواری چرای ژینە
ڕێگەی ئاواتی شیرینە
سەرچاوەی بیر وزانینە
هوشیارییە وڕاپەڕینە

* * *

خوێندەواری ئازادییە
سەرفرازییە وشادییە
چارەی دەردی هەژارییە
لەناو بەری بێ دادییە

* * *

خوێندەواری دەریای هەستە
شەوقی لالەی بیر ودەستە
بۆ میللەت چەکی مەبەستە
گزنگی وێژە وهەڵبەستە

* * *

بەرزی وپیتۆڵی و ناوداری
ئاوەدانی وگەشەداری
گەشت داهێنان وزانیاری
هۆی خوێندنەوە خوێندەواری

(مەدحەت بێخەو)

# قوتابخانه



شڤان خوێندکارێکی زیرەک و خۆشەویستە لە پۆلی پێنجەمی بنەڕەتی دەخوێنێت، ڕۆژێکیان بۆ دایک و باوکی لەسەر قوتابخانەی خۆی دەدوا و دەیگوت:

قوتابخانەی ئێمە زۆر پاکوخاوێنە، گۆڕەپانێکی فراوانی هەیە، لە وانەی وەرزش ئێمە هەموو جۆرە یارییەکی تێدا دەکەین و پاکوخاوێنی ڕادەگرین، بۆ پاکڕاگرتنی قوتابخانەکەمان لیژنەیەکمان پێکهێناوە، پێیدەڵێن لیژنەی پاکوخاوێنی. ئەم لیژنەیە لە ڕاگرتنی پاکوخاوێنی قوتابخانە بەرپرسە.

باوکی شڤان: شڤان، کوڕەکەم، لە قوتابخانەکەتان باخچە هەیە؟

شڤان: بەڵێ بابە.

دایکی شڤان: شڤان، کوڕەکەم، هەموو خوێندکاران ئەم ساڵ پێداویستییەکانی قوتابخانەیان وەرگرتووە؟

شڤان: بەڵێ دایە.
باوکی شڤان: کوڕەکەم، دەتەوێت لە دوارۆژدا ببیت بە چی؟
شڤان: حەز دەکەم ببم بە مامۆستا، بۆ ئەوەی کوڕ و کچانی کوردستان فێربکەم. هاوڕێکەشم حەز دەکات ببێت بە پزیشک بۆ ئەوەی چارەسەری نەخۆشەکان بکات. زانای هاوڕێشم حەز دەکات ببێت بە ئەندازیار، بۆ ئەوەی بەشداری بکات لە ئاوەدانکردنەوەی کوردستان .
باوکی شڤان: کەواتە قوتابخانە زۆر بەسوودە و کارگەی بەرهەمهێنانی مامۆستا و پزیشک و ئەندازیارانە.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
| --- | --- |
| لیژنە | : دەستە |
| بەرپرسە | : لە ئەستۆیەتی |
| بەسوود | : بە کەڵک |
| بەرهەمهێنان | : دروستکردنی بەرهەم |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. شڤان لە پۆلی چەندە؟
٢. ئایا لە قوتابخانەی شڤان باخچە هەیە؟
٣. لەکۆتاییدا باوکی شڤان چی گوت؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانە پڕ بکەوە:

١. لیژنەی پاکوخاوێنی ............... قوتابخانە دەپارێزێت.

٢. ............... خوێندکاران فێردەکەن.

٣. ............... نەخۆش چارەسەر دەکات.

## چالاکی (١)

مامۆستای بەڕێز،

دوو لیژنە لە خوێندکاران پێکبهێنە

١. لیژنەی پاکوخاوێنی    ٢. لیژنەی زانستی

هاوکارییان بکە بۆ ئەوەی هەر یەکەیان بەچاکی ئەرکی خۆیان بەرامبەر قوتابخانە بەجێبێنیت

## چالاکی (٢)

خوێندکاری خۆشەویست:

چەند دێڕێک لەسەر خوێندنگەکەت بنووسە لەبارەی تەلارەکەی، ژمارەی پۆل و مامۆستایان، گۆڕەپانەکەی، یارییەکان و پاکوخاوێنی و پاراستنی پەڕتوکەکان.

# مەشخەڵی ئۆڵۆمپی



ڕۆژانە کە خوێندن لە قوتابخانە تەواو دەبوو، شێرۆ و شیلان، چونکە دراوسێ بوون لە گەڕەکدا، بە یەکەوە لە قوتابخانە دەهاتنە دەرەوەوبەدەم ڕێگەوە بەرە وماڵ، چ شتێکی بە سوودیان لە مامۆستا ببیستایە دوور لە وانەکان، بۆ یەکدیان دەگێڕایەوە، شێرۆ ڕووی کردە شیلان و گوتی:

ئەمڕۆ مامۆستا لە پۆل باسی مەشخەڵی ئۆڵۆمپی بۆ کردین.

شیلان: ئادەی توخوا، بۆم بگێڕەوە، چونکە زۆر جار ناوی ئەم مەشخەڵەم بیستووە و شتێکی وای لەبارەوە نازانم.

شێرۆ: یۆنانییەکان لە کۆندا بە (گریک) ناسرابوون، هەموو جارێک کە یارییەکانی ئۆڵۆمپی دەستیان پێدەکرد، پێشەکی دەچوون مەشخەڵێکیان لە ئاگرەکەی شاری ( ئۆڵۆمپ ) دادەگیرساند و دەیانهێنایە ناوەڕاستی یاریگەکە، ڕایان دەوەستاند.

شیلان: بۆچی ئەوەیان دەکرد؟
شێرۆ: چونکە یاری و وەرزش نیشانەی هاوڕێیەتی و یارمەتی و پێشبڕکێی دۆستانەیە.
شیلان: کەواتە لەبەر ئەو هۆیە ئاگریان کرد بە نیشانەی یارییەکانی ئۆڵۆمپی.
شێرۆ: بەڵێ ئیتر دوای هەزاران ساڵ، کە یارییەکانی ئۆڵۆمپی هاتە کایەوە، مەشخەڵی ئۆڵۆمپیش لە گەڵیدا هاتەوە گۆڕێ.
شیلان: ئایا ئێستاش بەردەوامە؟
شێرۆ: بەڵێ ئێستاش، لە پێش دەستپێکردنی ئەو یارییانە، یەکێک لە یاریزانەکان مەشخەڵێک لە شاخی ئۆڵۆمپیدا دادەگیرسێنێت و بە ڕاکردن دەڕوات، تا دەیگەیەنێتە یاریگەی ئۆڵۆمپی، پاشان یارییەکە دەست پێدەکات.
شیلان: ئەی ئەگەر یارییەکانی ئۆڵۆمپی، ساڵێک لە وڵاتێکی زۆر دوور لە شاخی ئۆڵۆمپییەوە ئەنجامدران، بۆ نموونە لە وڵاتی چین کرا، ئاگرەکە چۆن دەگاتە ئەوێ؟
شێرۆ: مەشخەڵی ئۆڵۆمپی بە فڕۆکە دەگوێزرێتەوە بۆ فڕۆکەخانەی ئەو وڵاتەی، کە بڕیارە یارییەکانی تێدا ساز بکرێت و لە فڕۆکەخانەوە یاریزانێک وەریدەگرێت و بە ڕاکردن دەیگەیەنێتە یاریگەکە.
شیلان: ئاوا!

شێرۆ: بەڵێ، زۆرجار مەشخەڵەکە لە فڕۆکەخانە وەردەگیرێت، تا یاریگەکە چونکە لەتوانای یاریزانێکدا نییە، لەبەر ئەوە گەیاندنی دەکەنە نۆرە و لە ناوەڕاستی یاریگەکە شوێنێکی تایبەتی بۆ دروستکراوە، لەوێ ئاگری مەشخەڵەکە دادەگیرسێنن و بەم جۆرە یارییەکان دەست پێدەکەن.

شیلان: سوپاس بۆ تۆ کاکە شێرۆ و بۆ مامۆستاش، کە هەمیشە بە پەرۆشە بۆ فێرکردنمان.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| مەشخەڵ | : | چراوگە، خەتیرە |
| گریک | : | یۆنان |
| پێشبڕکێ | : | کێبڕکێ، گرەو |
| ئۆڵۆمپ | : | شاخێکە لە یۆنان |
| ببیستایە | : | گوێی لێبوایە |
| داگیرسا | : | هەلایسان |
| شاخ | : | چیا |
| ئاوا | : | هۆسا، بەم جۆرە |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. وەرزشکاران لە شولاری:

ئـ- توند و بەهێزیان هەیە.

ب- زوو تووشی نەخۆشی دەبن.

پ ـ سست و خاون لە کاروباردا.

٢. وەرزش نیشانەیە بۆ:

ئـ - دوژمنایەتی

ب - ئاشتیو برایەتی

پ ـ لە یەکتر دوورکەوتنەوە

٣. یاری ئۆلۆمپی لە کۆندا تایبەت بوو بە:

ئـ - فارسەکان

ب- عەرەبەکان

پ ـ یۆنانییەکان

## ڕاهێنان (٢)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. مەشخەڵی ئۆلۆمپی لە کوێی یاریگە دەوەستێنرێت؟

٢. ناوی هەندێك لەو یارییانە بڵێ، کە لە یاریی ئۆلۆمپیدا دەکرێن.

## چالاكی (١)

قوتابی خۆشەویست/ ئەمانە فێربە:

| زمان | چاو (چاڤ) | گوێ (گوهـ) |
|---|---|---|
| زمانشیرین | چاوگەش | گوێگر |
| زمانلووس | چاوتیژ | گوێیسووک |
| زمانزان | چاوجوان | گوێگران |
| زمانپاراو | چاودێر | گوێڕایەڵ |
| زماندرێژ | چاوشین | گوهدار |

ئەگەر مانای هەر وشەیەكت نەزانی لە مامۆستاكەت بپرسە.

## چالاكی (٢)

١. خوێندكاری هێژا تۆ لە چ تیپێك یاری دەكەیت و چ یارییەك دەكەیت؟

٢. ناوی چوار تیپی وەرزشی شارەكەت بنووسە.

٣. ناوی پێنج یاری كۆنی كوردەواری لە مامۆستاكەت بپرسە.

# کوردستان نیشتمانی ئێمەیە



کوردستان وڵاتێکی خۆش و جوانە، باپیرانمان زۆر لەمێژە لەسەر ئەم خاکە دەژین. هەردوو ڕوباری دیجلە و فوڕات بوون بە سەرچاوەی نیشتەجێبوون و شارستانیەت کە پێیدا تێدەپەڕن.

ئەگەر گەشتێک بە کوردستاندا بکەین، دەبینین پڕە لە شوێنەواری دێرین وەک ئەشکەوتی شانەدەر لە باکووری هەولێر و هەزارمێرد لە باشووری ڕۆژئاوای سلێمانی.

کوردستان وڵاتێکی بەپیت و فەڕ و دەوڵەمەندە. لەبەرئەوە دوژمن و ناحەزی زۆرە، هەمیشە مەیدانی جەنگی گەورە بووە، خەڵک و خاکەکەی ئازاری زۆریان لەپێناوی چێشتووە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ.

هەردەم بەرگرییان لە خۆیان و خاکەکەیان کردووە .

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| گەشت | : سەیران |
| فەڕ | : بەپیت |
| هەمیشە | : هەردەم |
| ئازار | : ئێش |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. ناوی هەندێک شوێنەواری دێرین بڵێ.

٢. بۆچی کوردستان هەمیشە مەیدانی جەنگ بووە؟

٣. کورد لە بەرامبەر دوژمنان هەڵوێستی چۆن بووە؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانە پڕ بکەوە:

١. کوردستان وڵاتێکی ............ و ............

٢. باپیرانمان زۆر ............ لەسەر ئەم خاکە ژیاون.

٣. هەردوو ڕوباری ............ و ............ پێدا تێدەپەڕن.

## چالاکی (١)

قوتابی خۆشەویست،

١. جگە لە ڕوباری دیجلە و فوڕات ناوی دوو ڕوباری دیکە بنووسە

١. ............. ٢. .............

٢. ناوی دوو شوێنەواری دیکەی کوردستان بنووسە جگە لەوانەی باسکراون.

١. ............. ٢. .............

٣. جگە لە شاری هەولێر و سلێمانی، ناوی دووشاری دیکە لە هەرێمی کوردستان بنووسە .

١. ............. ٢. .............

## چالاکی (٢)

قوتابی خۆشەویست، ئەم زانیارییانە لەبارەی کوردستان بزانە:

١. کوردستان بەسەر چوار دەوڵەتدا دابەشکراوە:

( تورکیا ، ئێران، عیراق، سوریا )

٢. ژمارەی دانیشتوانی کوردستان دەکاتە ٤٠ ملیۆن کەس.

٣. ڕووبەری کوردستان نزیکەی پێنج سەد هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.

٤. زۆر دەریاچە لە کوردستان هەن، وەک: دووکان، دەربەندیخان، ورمێ، وان، زرێبار.

# که ڕێوی بەڕۆژو دەبێت



سەر لە بەیانییەکی درەنگ، پیرە ڕێوییەک لە کونەکەی خۆی هاتە دەرەوە، تێرخەو بووبوو، زۆر برسیبوو، ڕوانییە چوار دەوری، باویشکێکی داو لە دۆڵە کشوماتەکەی ڕوانی، بە نیازی ئەوەی نێچیرێک بەدی بکات و بیکاتە قاوەڵتی ئەو ڕۆژە.

هیچی بەرچاو نەکەوت، ناچار ڕۆیشت، خێرا خێرا لووتی لە زەوی دەخشاند، وەک ئەوەی بۆنی نێچیرێکی کردبێت.

پیرە ڕێوی هەر ڕۆیی ... هەر ڕۆیی... لە لێژاییەکە بەرەو خوار بووەوە، بۆن و بەرامەی دووگ و گۆشتی بەرلووت کەوت، کە ورد بووەوە، سەرنجیدا پارچە دووگێکی چەور و نەرمی بە تەڵەیەکەوەیە و بە کەمێک گژوگیا و گەڵا داپۆشراوە، ئاو زایە دەمی، زمانی تەڕی بەم‌لاو ئەولای لمۆزیدا هێنا.

چاوەکانی هێندەی دیکە زیتبوون و کرانەوە، دەیزانی ئەگەر بچێتە پێش و دەمی بۆ بەرێت، ئەوا تەڵەکە دەتەقێت و گیانی دەکەوێتە مەترسییەوە و کار لە کار

دەترازێت، دەی باشە چی بکات؟ ڕێوی لەم خەیاڵانەدا بوو گورگێک ڕۆژباشی لێکرد و گوتی: ئەوە خێرە وا لێرە هەڵتوتاویت؟
ڕێوی:
دەک بەخێرهاتی: ئێستا لە بیری تۆدا بووم. ئا ئەو دووگ و گۆشتە چەورە دەبینیت! هەر شایستەی بەڕێزتە، فەرموو نۆشی گیانی بکە.
گورگە کەمێك سەرنجی داو وتی: ئەی گوایە خۆت بۆ نایخۆیت، برسیت نییە؟
ڕێوی: بەڵێ گەورەم، بەداخەوە ئەمڕۆ بەڕۆژوم.
گورگە چووە پێشەوە و بەر لەوەی لمۆزی بەر دووگ و گۆشتی چەور بکەوێت، دەستی ڕاستی بە تەڵەوە بوو.
تەڵەی ئاسن تەقەی هات، هاتەوە یەک و توند دەستی گورگەکەی گرت، بروسکەی ژان و ئازار بە گیانی گورگەدا دەهات و دەچوو، گرمۆڵە بوو، لووراندی خۆی راپسکاند، ئەم لاو ئەولای کرد تا خۆی رزگار بکات، هیچ سوودی نەبوو.
هەر لەگەڵ تەقینەوەی تەڵە، پارچە دووگ پەڕییە بەردەم ڕێوی و پەلاماریداو دەستیکرد بە خواردنی.
گورگەکە، کە ئەمەی دی بە دەم ئازارەوە گوتی: خوا بتگرێ ئەی تۆ بەرۆژو نەبوویت؟
ڕێوی بەدەم دووگ و گۆشت خواردنەوە گوتی: بەڵێ وابوو، بەڵام تەقەی تەڵەو لووره و ئازاریی تۆ بوونە بانگ و وامنیش ڕۆژوەکەم شکاند. گورگە لە سادەو ساویلکەیی خۆی و لە زۆرزانی ڕێوی سەرسام بوو.
گوتی: ئەی کەی جەژنە؟
ڕێوی بە تەوسەوە وتی: با خاوەن تەڵە بگاتە جێ، ئەو کاتە دەبێتە جەژن!!

## واناى وشەكان

| وشە | واتا |
|---|---|
| كشومات | : بێدەنگ |
| قاوەڵتی | : خواردن، بەرچایی |
| لووت | : كەپوو، لمۆز |
| لێژایی | : نشێو |
| هەڵتوتاویت | : دانیشتنی سەر چۆك |
| گرمۆڵە | : خۆخڕكردنەوە |
| ڕاپسكاند | : ڕاتەكاند |
| بەتەوسەوە | : بەتوانجەوە |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. ئایا ڕێوی بەرۆژو دەبێت؟

٢. ڕێوی چۆن گورگی خەڵەتاند وتووشی كرد؟

٣. چ وانە و پەندێك لەم چیرۆكە وەردەگرین؟

## ڕاهێنان (٢)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. ڕێوی لە تەڵەکە نەچووە پێش، چونکە دەیزانی:

ئـ - یاری لەگەڵ دەکات.

ب - لەلای خۆی دایدەنێت.

پ - توند دەیگرێت.

٢. گورگەکە بە تەڵەکەوە بوو لە ئەنجامی:

ئـ - بیرکردنەوەیەکی زۆر.

ب - هۆشیاری و زیرەکی.

پ- بیرنەکردنەوە لە گوتەکانی ڕێوی.

٣. ڕێوی گیاندارێکە زۆر حەز دەکات لە خواردنی:

ئـ - دارو درەخت

ب - گۆشتی مریشک

پ - گیای وشک

## چالاکی

چی فێربوویت لە ناوەڕۆکی ئەم بابەتە؟

# کورد



کورد سیارن، کورد شیارن
خورتە مێرن، جەنگە یارن
دپەیت وچڤت وهوشیارن
پەیا نابن، چکو دکارن

مافێ خۆ ب باسکان بستێنن

نێ دوژمن دووپشک و مارن
خابڤانن وگورگە هارن
چونکی فێلێت وان دیارن
دەست ودل بەفرەکا سارن

ئێدی باوەڕیێ نابینن

(فەیسەڵ مستەفا حاجی)*

---

* ساڵی ١٩٤٦ لە شاری ئامێدی لەدایك بووە دەرچووی بەشی زمانی کوردی لە زانکۆی بەغدایە لە ساڵی ١٩٦٨، شارەزای زمانی کوردییە.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| سیار | : | سوار |
| شیار | : | بەتوانا |
| پەیت | : | ئامادەباش |
| چڤت | : | چوست |
| پەیا | : | پیادە |
| باسک | : | زەند |
| خابڤان | : | فێڵباز |
| سار | : | سارد |
| ئێدی | : | چیتر، چیدی |
| دکارن | : | دەتوانن |

**داڕشتن : بە یارمەتی مامۆستا چەند دێڕێک لە سەر ئەم وتەیەی خـــوارەوە بنووسە ( نهێنی سەرکەوتن لە خۆڕاگریدایە ) .**

# گوڵفرۆش *



نازدار و خونچە هاوڕێ و هاوپۆلی یەک بوون، کاتێ لە قوتابخانەوە بەرەو ماڵ دەگەڕانەوە، دیتیان یەکێ لە دوکانەکانی نزیک قوتابخانەکەیان کراوە بە دوکانی گوڵفرۆشی.

نازدار بە خونچەی گوت: وەرە با لەم دوکانە بۆ خۆمان تێر سەیر و بۆنی گوڵ بکەین.

خونچە گوتی:

نازدار من زۆر حەزم لە گوڵە، بەڵام لەم دوکانەدا من بێجگە لە تابلۆی گوڵ هیچ گوڵێک نابینم، بەڵام لەبەر خاتری تۆ هەر دێم.

هەر هێندەی چوونە ناو دوکانەکەوە، دوکاندارەکە بە ڕوویەکی خۆشەوە بەرەو پیریان هات و گوتی:

فەرموو گوڵەکانم ... (چیتان دەوێت بۆتانی جێبەجێبکەم) .

کە گوێیان لە گفتاری دوکاندارەکە بوو بیریان بۆ ئەوە چوو ڕەنگە ئەوەی کاری پەروەردەکردن و فرۆشتنی گوڵ بێت دەبێت گفتاریشی وەک گوڵ بێت.

---

* ئەم چیرۆکە لە کتێبی (حەوت وانەی فەلسەفی) نووسینی: کەریم مستەفا وەرگیراوە و کورت کراوەتەوە.

نازدار گوتی:

ئێمە هاتووین سەیرو بۆنی گوڵ بکەین، بەڵام بێجگە لەم تابلۆی گوڵانە، خۆ تاقە گوڵێکیش چییە لەم دوکانە نییە.

دوکاندارەکە گوتی: خونچەکان

خونچە قسەکەی بە دوکاندارەکە بڕی گوتی:

تەنها من ناوم خونچەیە، هاوڕێکەم ناوی نازدارە، بەڵام تۆ چۆن زانیت من ناوم خونچەیە؟

دوکاندارەکە گوتی:

ببورە من نەمزانیوە  کە تۆ ناوت خونچەیە، بەڵکو من ویستم بە زمانی گوڵ لەگەڵتان بدوێم.

نازدار گوتی:

ببورە، ئەوە بۆچی لە دوکانەکەتدا هیچ گوڵێک نییە، تەنها تابلۆی گوڵتان هەڵواسیوە.

گوڵفرۆشەکە گوتی:

گوڵەکان لە باخێکی دوورن، هەر کەسێکیش حەزی لە چ جۆرە گوڵێک بێت و هەڵیبژێرێت، ئێمە دەچین و بۆی دەهێنینە ئێرە.

نازدار و خونچە بە کابرای دوکانداریان گوت:

دیارە گوڵ هەر لەسەر لقی خۆی جوان و ڕەنگینە.

بۆیە زۆر سوپاسی گوڵفرۆشەکەیان کرد و لە دوکانەکە هاتنە دەرێ و بەرەو ماڵ بە جووتە گەڕانەوە.

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. نازدار و خونچە کە لە قوتابخانە بەرەو ماڵەوە دەگەڕانەوە لە دوکانەکانی نزیک قوتابخانەکەیان چ گۆڕانکارییەکیان بەدی کرد؟

٢. ئایا لە دوکانی گوڵفرۆشەکەدا چ جۆرە گوڵێکیان بینی؟

٣. گوڵفرۆشەکە بە چ زمانێک لەگەڵ نازدار و خونچەدا ئەدوا؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم ڕستانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. لەم دوکانەدا من بێجگە لە تابلۆی گوڵ هیچ ................ نابینم.

٢. خونچە و نازدار ................ یەکتر بوون.

٣. گوڵفرۆشەکە بە زمانی ................ قسەی لەگەڵ نازدار و خونچەدا دەکرد.

## چالاکی (١)

قوتابی ئازیز دەتوانیت چەند دێڕێک لەسەر گوڵ بنووسی؟

## چالاکی (٢)

بە خەتێکی جوان لە تێنووسەکەت بنووسە:

**(بیر لەوە بکەوە کە هەمیشە گوڵ بیت)**



# حەوت سەمەرەی جیهان [1]



مرۆڤایەتی هەر لە سەرەتای بوونیەوە لەسەر ئەم زەمینە پان و بەرینە کە بە (زەوی) ناسراوە، لە هەوڵ و کۆششدا بووە لەگەڵ سروشتدا بۆ مانەوەو درێژەدان بە ژیانی.

ئێمەی نەوەی ئەوان لەم ڕۆژگارەدا زۆر بە گرنگی و سەر سوڕمانەوە دەڕوانینە پاشماوە و جێگە دەستەکانی ئەوان، کە توانیویانە بە کارامەیی و دەست ڕەنگینانە کۆشک و تەلار و پەیکەرو پەرستگای وا سەمەرە دروستبکەن کە بە هەزاران مرۆڤ کاری تێدا کردبێت و دەیان ساڵی خایاندبێت لەگەڵ ئەوەی هیچ کەرەسەیەکی پێشکەوتووی خانووبەرەی ئەوتۆ نەبووە کە ئەمڕۆ لەبەر دەستدایە...

---

(١) ئەنتەرنێت

لەو پاشماوانە ئەو حەوت کارە سەرسوڕهێنەرەیە کە بە (حەوت سەمەری جیهان) ناسراون کە بریتین لە:

١. باخچە هەڵواسراوەکانی بابل لە( عیراق)

٢. ئەهرامەکان لە (میسر)

٣. پەیکەری ڕۆدۆس لە(یۆنان)

٤. منارەی ئەسکەندەرییە لە(میسر)

٥. پەیکەری زیۆس لە (یۆنان)

٦. پەرستگەی دیانا لە( تورکیا)

٧. مەزاری مۆزۆڵ لە هالکرناس لە (تورکیا)

ئەو حەوت کارە مەزنانە کە تا ئەمڕۆ ماونەتەوە، بوونەتە بابەتی لێکۆڵینەوە و جێگای گەشتوگوزار، کە ساڵانە هەزاران کەس ڕوویان تێدەکات و بوونەتە مایەی سەرچاوەی داهاتێکی زۆر بۆ وڵاتەکانیان.

ئێمەش وەک کورد، خاوەنی دێرینترین شارستانی سەر ڕووی ئەم زەمینەین کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٢٧٠٠) ساڵ پێش ئەمڕۆ، بۆیە پێویستە لەسەرمان هەوڵ وکۆششی سەرکەوتووانە بدەین لە بواری زانین وپێشکەوتنی زانستی، تا وڵاتەکەمان رازاوە و پێشکەوتوو بێت وسەرنجی گەلانی هەموو جیهان بۆ لای خۆمان ڕابکێشین.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| سەمەرە | : سەرسورهێنەر |
| نەوە | : ڕۆڵە |
| دێرین | : کۆن |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. بە درێژایی مێژوو مرۆڤ لە ململانێدا بوو لەگەڵ سروشت، بۆچی؟

٢. گرنگی پاشماوە کۆنەکان چییە بۆ وڵاتان؟

٣. کورد خاوەنی کۆنترین شارستانی بووە لە مێژوو، کامەیە؟

٤. ئەرکی ئێمەی خوێندکار چییە بەرامبەر پاشماوە کۆنەکانی وڵاتەکەمان؟

## ڕاهێنان (٢)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. باخچە هەڵواسراوەکانی بابل دەکەوێتە وڵاتی (سوریا، عیراق، ئێران).

٢. پەرستگەی دیانا دەکەوێتە وڵاتی (تورکیا، چین، یۆنان).

٣. هەرەم دەکەوێتە وڵاتی (چین، سوریا، میسر).

## ڕاهێنان (٣)

ئەم وشانە بخەرە ڕستەوە:

(زەوی، کۆشک ، پەیکەر، خامە ، جەنگاوەر )

## چالاکی:

**مامۆستا داوا لە خوێندکاران بکات، کە ناوی چەند شوێنەوار و قەڵایەکی بە ناوبانگ لە کوردستان بڵێن**

# شاری کەرکوک



کەرکوک شارێکی دێرینی کوردستانە، یەکێکە لە شارە پیشەسازییەکانی هەرێمی کوردستان، ئەم شارە مێژوویەکی دێرینی هەیە زۆر لەمێژە ئاوەدانە. لەم شارەدا قەڵایەکی کۆن هەیە، تا ئێستا پاشماوەی ماوە و کەوتۆتە ناوجەرگەی شارەکەوە و لە ڕۆخی ڕوباری خاسەیە. ڕوباری خاسە شاری کەرکوکی کردووە بە دوو بەشەوە.

بەری قۆرییە وبەری قەڵا، گەڕەکەکانی بەری قۆرییە بریتین لە:

(قۆرییە، شاترلو، ڕەحیماوا، عەرەفە*، تەپە) و گەڕەکەکانی بەری قەڵا بریتین لە:

(ئیمام قاسم، شۆریجە، موسەڵلا، دەروازەی شار، ئازادی) دانیشتوانی شاری کەرکوک بە زۆری کوردن، لە تەک کورد عەرەب و تورکمان و ئاشوری و ئەرمەنی لەم شارەدا دەژین.

---

* عەرەفە لەناوی (ئەرەبخا)وە هاتووە کە ناوی کۆنی کەرکوکە.

چەندین ساڵە ڕژێمە یەک لەدوای یەکەکانی عیراق هەوڵدەدەن ژمارەی کوردەکانی کەرکوک کەم بکەنەوە و وەکو شارێکی عەرەبی لێبکەن و سیما کوردییەکەی بسڕنەوە، لەگەڵ ئەمانەشدا شاری کەرکوک وەك شارێکی کوردنشین و بە بەشێك لە کوردستان ماوەتەوە و ڕەسەنایەتیی کوردستانێتی خۆی پاراستووە.

لە شاری کەرکوک ئەم هۆز و خێڵە کوردانە هەن (شوان، تاڵەبانی، داودە، ساڵەیی، هەمەوەند، جاف، جەباری، زەنگەنە، ڕۆژبەیانی، زەند، بەرزنجی، شێخان .... ) دانیشتوانی کەرکوک بەزۆری لەسەر ئایینی ئیسلامن، لە هەمان کات مەسیحیشی تێدا هەیە، هەر یەکەو مزگەوت و تەکیە و کڵێسە و پەرستگای خۆی هەیە، کەرکوک شارێکی پیشەسازییە، چەندین بیرە نەوتی گەورەی تێدایە، کە ناودارترینیان بیری (باباگوڕگوڕ)ە، نەوتی کەرکوک سەرچاوەیەکی گرنگی داهاتی ئابووری عیراقە.

ئەم شارە، مەڵبەندێکی ڕۆشنبیری و زانیاری کۆنی کورد بووە، چەندین مامۆستای ئایینی و شاعیر و کەسایەتی ناوداری گەلەکەمانی تێدا پەروەردە بووە، وەک: (شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ئەسیری، ڕەفیق حیلمی، مارف بەرزنجی، عەبدولسەمەدی خانەقاو لەتیف حامد.....). ئەم شارە پیرۆزەی کوردستان لە ٢١ ئازاری ساڵی ١٩٩١ کە یەکەم ڕۆژی بەهاربوو، لەلایەن هێزی پێشمەرگە و جەماوەری بە شەرەفی شاری کەرکوکەوە بۆ یەکەمجار لە دەست بەعسییەکان ئازادکرا و بەرگی شادی وخۆشی بە بەردا کرا.

ئاگری نەورۆز وڕاپەڕین و ڕزگاریی شارەکەی ڕوناککردەوە و بۆ جارێکی دیکە سەلماندی، کە شاری کەرکوک شاری کوردانە.

لەگەڵ پرۆسەی ئازادیی عیراق لە ساڵی (٢٠٠٣)دا خەڵکی بە شەرەفی کەرکوک و هێزی پێشمەرگە شارەکەیان ئازادکرد لە دەست بەعسییە داگیرکەرەکان جارێکی دیکە ئەم شارە خۆشەویستە گەڕایەوە نێو باوەشی کوردستان و دانیشتوانە ئاوارەکانی گەڕانەوە نێو زێدی باووباپیرانیان و ئەمڕۆ ئەم شارە بۆتە شاری برایەتی و پێکەوەژیان.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| دێرین | : کۆن |
| ڕۆخ | : لێوار، کەنار |
| پاڵ | : تەنیشت، لا |
| سیما | : ڕوو، شێوە |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. بۆچی شاری کەرکوک ململانێی لەسەر دەکرێت؟

٢. ناوی سێ گەڕەکی شاری کەرکوک بنووسە لەبەری قەڵا.

٣. ناوی چەند هۆزو خێڵی پارێزگای کەرکوک بنووسە.

٤. ناوی چەند قەزاو ناحیەی سەر بە پارێزگای کەرکوک بنووسە.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. کەرکوک شارێکی دێرینی ..................

٢. ڕوباری .................. شاری کەرکوکی کردووە بە دوو بەشەوە.

٣. دانیشتوانی شاری کەرکوک پێکدێن لە ..................، ..................، ..................

٤. .................. یەکێکە لە هۆزانڤانە بەناوبانگەکانی کەرکوک.

٥. لە ساڵی .................. شاری کەرکوک ڕزگار کرا.

## ڕاهێنان (٣)

چەند دێرێک لەسەر شاری کەرکوک بنووسە.

# خانزادی سۆران



نەتەوەی کورد بە درێژایی مێژوو چەندین ناوداری لە گەورە پیاوو شێرەژنانی بە خۆیەوە دیوە، کە ناو و کردەوەکانیان بە زیندوویی ماونەتەوە مێژوو بە شانازییەوە باسیان دەکات، یەکێک لەوانە خانزادی سۆرانە.

خانزاد کچی حەسەن بەگە و وەکو مێژوونووسی ناوداری کورد محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە پەڕتوکی (ناودارانی کورد) دەڵێ ژنی میر سلێمانی کوڕی شاکەلی بەگی میری سۆران بووە. خانزاد ئافرەتێکی باڵابەرز و جوان و ڕێکوپێک بووە، ئازا و بەجەرگ و سوارچاك بوو، بە وێنەی پیاو چەکی هەڵگرتووە و خۆی لە پێشەوەی چەکدارەکان ڕۆیشتووە.

کاتێک سلێمان بەگی میری سۆران لـە لایـەن حکومـەتی بەغـداوە دەگیرێـت و دەخرێتە بەندیخانە و لەوێ دەرمـانخوارد دەکرێـت و دەمرێـت، خـانزادی شـێرەژن کاروباری میرنشینی سۆران دەخاتە ژێر دەستی خـۆی وبـە زانـایی و لێهـاتوویی کاروباری میرنشینی لە شاری هەریر بەڕێوە دەبات.

خانزاد بـە هـەموو توانـای خـۆی خزمـەتی میرنـشینی سـۆرانی کـردووە و پارێزگاری لە سەربەخۆیی کردووە و بەهیچ شێوەیەک ملـی بـۆ ئیمپراتۆریـەتی عوسمانی کەچ نەکردووە بۆیە هەتا ئەو فـەرمانڕەوا بـووە میرنـشینی سـۆران سەربەخۆ بووە.

خانزاد گەلێک مزگەوت وقەڵای بەرگری وقوتابخانە و پـردی دروسـتکردووە و وڵات لە سایەی فـەرمانڕەوایی ئـەو ئـارام و هـێمن بـووە، زۆرجـار جلوبـەرگی پیاوانەی پۆشیوە وبەشەو لەگەڵ چەند پاسەوانێکی بەناو شاردا گەڕاوە وگـوێی لە داماو وهەژاران گرتووە وپێداویستییەکانی بۆ جێبەجێ کردوون.

ئێستاش لە سنووری میرنشینی جارانی سۆران چەند کۆنە قەڵایەک مـاون و گەواهی بۆ مەزنی وسەربەرزیی خانزاد دەدەن.

زۆری نەخایاند خانزاد مرد و بە مردنی، میرنشینی سـۆران بـەرەو کـزی چـوو و سـەرکردە ومیرەکـانی دوای ئـەم نـەیانتوانی کاروبـاری وڵات بـە ڕێکـوپێکی بەڕێوەببەن، بۆیە حکومەتی عوسمانی هەلی بۆ هەڵکەوت ولەشکرێکی گەورەی نارده سەر هەریر وولاتی سۆرانی داگیرکرد.

بەم جۆرە میرنشینی سۆران دوایی پێهـات، بـەڵام خـانزادی دلێـر بـۆ هـەموو لایەکی سەلماند، کە ژنی کوردیش خاوەن دەسەڵاتە وجیاوازی لەگەڵ پیاودا نییە.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| مەزن | : گەورە |
| بەندیخانە | : گرتووخانە |
| قارەمان | : ئازا و بەجەرگ |
| ناودار | : ناڤدار، بەناوبانگ |
| گەواهی | : شاهیدی |

## ڕاهێنان

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە یەکێک لەم وشە گونجاوانە پڕ بکەوە:

(دەست- سۆران- خانزاد- سوارچاک)

١. ............. ئافرەتێکی بالأبەرز و جوان و ڕێکوپێک بوو.

٢. چەپڵە بە یەک ............. لێنادرێت.

٣. بە مردنی خانزاد میرنشینی ............. بەرەو کزی چوو.

٤. خانزاد ئازا و بەجەرگ و ............. بوو.

---

**سەرچاوەکان:**


١. خانزادو لەشکری/ نووسینی: محەمەد تۆفیق وردی چاپی بەغدا ١٩٦٠.

٢. ئافرەتە ناودارەکانی کورد/ نووسینی: عەبدولجەبار محەمەد جەباری چاپی کەرکوک ١٩٦٩.

## چالاکی (١)

**مامۆستای بەڕێز،**

**بە کورتی باسی ڕۆڵی ژنی کورد لە کۆمەڵی کوردەواری بۆ قوتابییەکانت بکە.**

## چالاکی (٢)

**خوێندکاری خۆشەویست،**

**ناوی ئەم ژنە ناودارانە بزانەو ئەگەر ویستت زیاتر لە بارەیانەوە بزانیت، پرسیار لە مامۆستاکەت بکە:**

**١. قەدەم خێر**

**٢. ڕەوشەن بەدرخان**

# کونە کەروێشک



ئەو ڕۆژەیماڵی ئارام گەڕانەوە گوندەکەی خۆیان، خەڵکی گوندەکە بە گەرمی بەخێرهاتنەوەیان لێکردن.

ئارام و هاوڕێکانی ئەو شەوەیان بە باسکردنی بیرەوەرییەکانیانەوە بەسەربرد، ڕۆژی دوایی ئارام و شێرۆی هاوڕێی و چەند منداڵێکی دیکە بۆ یاریکردن چوونە دەرەوەی گوندەکە.

ئارام گوتی:

شێرۆ، لەبیرتە جاران دەچووینە سەر کونە کەروێشکەکان و بە بەرد تەقەتەقمان دەکرد، ئەوجا کەروێشکەکان لە کونەکە دەردەپەڕین و یاریمان لەگەڵ دەکردن.

شێرۆ گوتی:

ئارام گیان ئەو کاتە خۆشانە چۆن لەبیر دەچێتەوە؟

بە دەم قسەکردنەوە ئارام کونە کەروێشکێکی لە دوورەوە دیت، خێرا دوو بەردی هەڵگرت و گوتی:

ئەها ئەو کونە کەروێشکە، ئادەی شێرۆ گیان بتبینم! شێرۆ و هاورێکانی هاواریان کرد:

نەکەی ئارام، نەکەی، ئەی نەتزانیوە ئەو ناوە هەمووی مین ڕێژکراوە؟

کەروێشکەکانیش لە ترسی (مین) ئەو ناوەیان چۆلکردووە.

ئارام حەپەساو گوتی:

ئەی باشە بۆ هیچ نیشانەیەکی لێ نییە؟ خۆ ئەگەر تەنیا بوومایە دەکەوتمە ناو مینەوە. شێرۆ هەر دەبێ ناوچەکەمان پاک بکەینەوە و دەست بکەینەوە بە یارییە خۆشەکانی جاران.

مندالەکان کۆمەڵە بەردیان بۆ نیشانەکردنی شوێنەکە داناو بە ڕاکردن چوون ئەنجومەنی گوند ئاگادار بکەنەوە.

چیرۆکی: نوری سەعید قادر

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| کات | : وەخت گاڤ |
| حەپەسا | : سەرسام بوو |
| دیکە | : تر |
| بەدیکرد | : بینی |

## ڕاهێنان (١)

وەلاّمی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. مین چییە؟

٢. مەترسییەکانی مین چین بۆ مرۆڤ؟

٣. جۆرەکانی مین چین؟

## ڕاهێنان (٢)

نیشانەکانی ناوچە مین ڕێژکراوەکان ئەمانەن:





١.

٢.

٣.

٤.

## ڕاهێنان (٣)

ئەگەر (مین)م بینی:




١. بەردی تێدەگرم.

٢. دەری دەهێنم.

٣. دوور دەکەومەوە و لە خۆم گەورەتر ئاگادار دەکەم.

## چالاکی (١)

١. دوژمنانی گەلەکەمان لە جیاتی گوڵ و نەمام لە کوردستان بچێنن. چییان چاندووە؟ بۆچی؟

٢. مینی دژەکەس و دژەتانک چییە؟

## چالاکی (٢)

قوتابی خۆشەویست: تەماشای ئەم وێنانە بکەو لە سەریان بدوێ.



سێگۆشەی سوور



ئالأی سوور



چوارگۆشەی سوور



تێلدڕ(سیم)ە



کەڵەکە بەرد

# بەفربارین



ئای لەم بەفرە باریوە          زەوییەک پارچە زیوە
نە بەرد دیارە نە درەخت          نە هەورازی بەرز و سەخت
هەمووی لە بەفرا کپە          بێ سروەیە و بێ چپە
مندالاًن دەی یاریکەین          جێی یاریمان دیاریکەین
دەی گورج ببنە، دوو بەرە          (هێمن) ڕاکە، (هێرش) وەرە
(هیوا) تۆپەڵێ خڕکە          گوێی (رزگار)ی پێ سڕکە

**لەتیف هەڵمەت***

---

* لەتیف هەڵمەت: ناوی (لەتیف کوڕی مەحمود)ە و لە ساڵی ١٩٤٧ لە شاری کفری لە دایک بووە، ئێستا لە شاری سولەیمانی دەژی. چەند شیعری ناسکی دیکەی بۆ ئێوەی ژیکەڵ و زیرەك داناوە.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| هەوراز | : هەرواز |
| کپ | : بێدەنگ و ئارام |
| سروە | : شنە |
| چپە | : قسەکردن بە هێواشی، چرپە |
| گورج | : خێرا |
| ڕووبەر | : پانتایی |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. لە چ وەرزێک بەفر دەبارێت؟

٢. سوودی بەفربارین چییە؟

٣. چۆن شێرە بەفرینە دەکرێت؟

**داڕشتن:**

خوێندکاری خۆشەویست، چەند دێرێک لەسەر بەفربارین ووەرزی زستان بنووسە.

# بەهاری راپەڕین



ئەگەر ئامارێکی ورد بۆ ڕۆژانی خۆشی و شادییەگەلی کورد بکەین و بەراوردیان بکەین لەگەڵ ڕۆژانی پڕ ئازار و مەرگەسات، ئەوا بێگومان کارەساتە دڵتەزێنەکان بە ڕادەیەک زۆرن لە ژماردن نایەن، ڕاپەڕینی کاوەی ئاسنگەر (٧٠٠ ساڵ پێش زایین) نیشانەی ئازایەتی و قارەمانییەتی نەتەوەی کورد و ڕەتکردنەوەی جەورستەم بووە.

لە ئەنجامی شۆڕش و خەباتێکی درێژخایەن لە بەهاری ساڵی هەزارو نۆسەدو نەوەدو یەک لە کوردستانی باشوور ڕاپەڕینێکی سەرتاسەری بێوێنە ئەنجامدرا. کورد دەڵێ: (جام کە پڕ بوو لێی دەڕژێ و رقیش کە پڕ بوو دەتەقێتەوە)، بۆیە ئەو رق و کینەی لە دڵ و دەروونی جەماوەری چەوساوەی گەلی کورد پەنگی خواردبووەوە، بوو بە ئاگر و گڕی گرت و بڵێسەی لە (١٩٩١/٣/٥) پێنجی ئاداری هەزارو نۆسەدو نەوەدو یەک شاری (ڕانیە)ی داگرت و جەماوەر

بوێرانە لە کووچە و شەقامەکانەوە ڕژانە ناو شار و دژی دامودەزگاکانی ڕژێم و نۆکەرانی ڕاپەڕین و شاریان ئازادکرد، بەم دەستپێشخەرییەش (ڕانیە) بوو بە یەکەم کڵپە و هاندەر و ڕێنیشاندەر بۆ شار و شارۆچکەکانی دیکەی کوردستانی باشوور و ناسنامەی شیاوی (دەروازەی ڕاپەڕین)ی بۆ خۆی لە مێژووی کورد وکوردستان تۆمارکرد.

بەڵێ، ڕۆژانی پێنج تاکو بیستی ئاداری هەزارو نۆسەدو نەوەدو یەک بۆ ئێمەی کورد لە ڕۆژە هەرە پڕشنگدارەکانی مێژووی نوێی نەتەوایەتیمانە، کە لەم ماوەیە جەماوەری کوردستان لە دەزگا سەرکوتکەرەکان ڕاپەڕین و سەرجەم شار و شارۆچکەکانی کوردستانی باشووریان ئازادکرد، لە ترۆپکی ئەم ڕاپەڕینە جەماوەرییەدا شاری (کەرکوک) تەوقی بە عەرەبکردن شکاند و هاتەوە باوەشی کوردستان.. ئازادکردنی کەرکوکیش ئەو ڕاستییەی سەلماند کەگۆڕینی بە زەبر و زۆری دابڕینی هەر پارچەیەک لە کوردستان تا سەر نییە.

ڕاپەڕینی بەهاری هەزارو نۆسەدو نەوەدو یەک دەستکەوتێکی مەزن بوو بۆ نەتەوەی کورد، چونکە یەکەمجار بوو لە مێژووی کورد هەموو میللەت بە یەک جار و بە یەک دەنگ و یەک بڕیار بێتە گۆڕەپانی تێکۆشان و کۆڵنەدان، کە ئەوەش هێمایەکی یەکریزی گەلەکەمانە لەکاتی پێویست و لە ئاستی پرسە چارەنووس سازەکان.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
| --- | --- |
| ئامار | : سەرژمێر |
| ڕادە | : ڕێژە ، سنوور |
| جەوروستەم | : زوڵم و زۆرداری |
| زایەڵە | : دەنگێکی بڵند |
| چەخماخەی ڕاپەڕین | : خەتیرا سەرهەڵدانێ |
| کووچە | : کۆڵان |
| دەروازە | : دەرگە |
| ترۆپک | : لووتکە |
| بە عەرەبکردن | : دەرکردنی کورد لە شوێنێکی کوردستان و هێنانی عەرەب بۆ ئەو شوێنانە. |
| هێما | : نیشانە ، سومبل |
| بوێرانە | : ئازایانە |

## ڕاهێنان (١)

بۆ ئەم بۆشاییانەی خوارەوە، وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. ڕاپەڕینی کاوەی ئاسنگەر ............... ساڵ پێش زایین بوو.

ئـ- ٧٠ ب- ٧٠٠ پ- ٧٠٠٠

٢. چەخماخەی ڕاپەڕین لە بەهاری ساڵی ............... لەکوردستانی باشوور هەڵگیرسا.

ئـ- ١٩١٩ ب- ١٩٩١ پ- ٢٠٠٥

٣. شاری ............... ناسنامەی دەروازەی ڕاپەڕینی بۆ خۆی تۆمارکرد.

ئـ- سلێمانی ب- هەولێر پ- ڕانیە

٤. ڕۆژی (٢٠)ی ئاداری ساڵی (١٩٩١) شاری ............... ئازادکرا.

ئـ- کەرکووک ب- بەغدا پ- دهۆک

## ڕاهێنان (٢)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە :

١ – ڕاپەڕین چییە ؟

٢ – سێ دەستکەوتی ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ بژمێرە ؟

## چالاكی (١)

مامۆستای بەڕێز، بۆ زیاتر ڕوونكردنەوە و چەسپاندنی بنەماكانی دیموكراسی، كە ئامانجێكی ڕاپەڕین بوو، كارێكی پڕاكتیكی ئەنجامبدە، ئەویش هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پۆلە بە شێوەیەكی ئازادانە بۆ ڕێكخستنی كاروباری پۆل وەك: (خاوێن كردنەوە، داخستنی دەرگا و پەنجەرەكان دوای تەواوبوونی دەوام، پاراستنی كەرەستەكانی كارەبای ناو پۆل... هتد).



## چالاکی (٢)

ڕاپەڕین ڕاپەڕاندن

سووتان سووتاندن

خوێندکاری خۆشەویست تۆش ئەم پەیڤانەی خوارەوە وەک ئەمانەی سەرەوە لێبکە:

کوڵان ..............

ڕژان ..............

دڕان ..............

دەرچوون ..............

فڕین ..............

قیژان ..............

ڕووخان ..............

## چالاکی (٣)

قوتابی خۆشەویست: چەند دێڕێک لەسەر مەبەستی ئەم هۆنراوەیە بنووسە:

قەت مەڵێن دوژمن بەهێزە تۆپ و تەیارەی هەیە

ئیتفاقتان گەر هەبێ زۆر زەحمەتە خۆی ڕاگرێ

# شێخ مەحمودی نەمر



یەکێک لە پیاوە ناودار و قارەمانەکانی گەلەکەمان ، شێخ مەحمودی نەمرە، لە ساڵی(١٨٨١)ز لەدایک بووە و بەشێخ مەحمودی حەفید ناسراوە، ئەم قارەمانە بە درێژایی ژیانی پڕ لە سەروەریی خۆی لە پێناوی مافە ڕەواکانی میللەتەکەی تێکۆشاوە، لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ شێخ سەعیدی باوکی لە سلێمانییەوە بۆ شاری موسڵ دوورخراونەتەوە.

دوای داگیرکردنی عیراق لەلایەن ئینگلیزەکانەوە و هاتنیان بۆ کوردستان، شێخ مەحمودی نەمر بە هەموو توانایەوە داوای مافی گەلی کوردی کرد، بەڵام داگیرکەران داواکارییەکەیان جێبەجێ نەکرد، بۆیە لە ساڵی(١٩١٩)شۆڕشێکی گەورەی بەرپاکرد، بەڵام داگیرکەر بە فڕۆکە و هێزی زۆرەوە شۆڕشەکەیان کپ کردو شێخ مەحمود بە برینداری لەژێر بەردەقارەماندا بە دیل گیرا و فەرمانی

لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو، پاش ئازادکردنی دووبارە گەڕایەوە شاری سلێمانی، حکومەتی کوردستانی دامەزراند و خۆی بوو بە مەلیکی کوردستان، لە سەردەمی حوکمڕانی شێخ مەحموودا، تەوژمی ئەدەبیات ونووسین وزمان بەرەو پێشەوە چوو، ڕۆژنامەیەک بەناوی (ئومێدی ئیستیقلال) دەرچوو. بۆ یەکەم جار لە مێژووی کوردا پوولی پۆستە دەرچوو، ئەو تەوژم و پێشکەوتنە کالآی ماندوویی لە سالّی (١٩٢٢) لە جەستەی شەکەتی کورد کردەوە، پشتێنی ئاسوودەیی تا ماوەیەک بەردەوام بوو.

سالّی(١٩٢٢)لە مێژووی کوردا سەرباسێکی زێرینە گەر لە مێژوودا ئەو سالّە بێت کە لە دەڤەرێکی کوردستانا یەکەم قەوارەی نوێی کورد دامەزرا و شێخ مەحمودی پێشەوا بە فەرمی بوو بە (مەلیکی کوردستانی باشوور) ئەمە بۆ ڕۆشنبیری و خوێندەواری کەلەپووری کوردی بە وەرچەرخان و سالّی نوێی لەدایکبوون دەژمێردرێ.

لە ڕۆژانی دەستەلاّتی شێخدا زمانی کوردی بە فەرمی بوو بە زمانی نووسین و خوێندن لە دامودەزگاکانی دەولّەت و قوتابخانە وخوێندنگەکان.

ڕۆژنامەگەری کوردی لەو ڕۆژگارە دا چالاکانە پەرەی سەند، شعیر وچیرۆک و نووسین بوون بە چەکی پاراستنی شۆرش و ئەو قەوارەیەی کورد.

تا لە سالّی(١٩٢٤)هیوای کورد دووبارە لەناوچوو دوژمن سلێمانی داگیرکردەوە بەلاّم نەیتوانی ڕێگا لە ئاخاوتن و نووسینی زمانی کوردی بگرێت .. ئەو قارەمانە بەردەوام بوو لەسەر تێکۆشان تا سالّی (١٩٥٦) بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد و لە شاری سلێمانی لە ئارامگەی پیرۆزی کاکە ئەحمەدی شێخ بە خاک سپێردرا.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| ناودار | : بناڤو دەنگ، بەناوبانگ |
| سەروەری | : سەربلندی |
| تێکۆشاوە | : هەوڵی داوە |
| داواکاری | : داخازی |
| بەرپاکرد | : هەڵایساند |

کپکرد : بێدەنگ کر

بەردەقارەمان : بەردێکی گەورەیە لە دەربەندی بازیان کە شێخ مەحمود لەوێدا بریندارکراو بە دیل گیرا.

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. کێ عیراق و کوردستانی داگیرکرد؟

٢. شێخ مەحمودی نەمر داوای چی کرد؟

٣. شێخی نەمر لە کوێ بریندار بوو؟

٤. کێ بوو بە مەلیکی کوردستان؟

٥. ئومێدی ئیستقلال چی بوو؟

## چالاکی

گەورە × بچووک

بڵند × نزم، نەوی

قوتابی خۆشەویست تۆش دژەواتای ئەم وشانەی خوارەوە بنووسە:

خێرا × ...............

جوان × ...............

درێژ × ...............

ئازا × ...............

ڕووناک × ...............

# دەنکە گەنمێک



مێروولەیەک لەسەر ڕێیەک دەنکە گەنمێکی قەڵەوی دۆزییەوە، لە دڵی خۆی گوتی:

دەنگ مەکە خوا ناردویەتی، بەخوا دەنکە گەنمی چاکە، بێدەنگ دەیبەمەوە ماڵەکەم و هەڵیدەگرم بۆ زستان.

ئەوەی گوت و کەوتە ڕاکێشانی دەنکەگەنمە قەڵەوەکە بەرەو ماڵەکەی، بەڵام بەدەستییەوە ماندوبوو.

مێروولەیەکی سورباو چوو بەهانای مێروولەکەوە و پێی گوت:

ماندو نەبیت مێروولە ڕەشەی هاوڕێم هاتوم یارمەتیت بدەم.

مێرووله ڕەشە بەساردییەکەوە گوتی:
برۆ بەڕێی خۆتەوە پێویستم بە یارمەتی تۆ نییە.
مێرووله سورباوەکە پێی گوت:
با یارمەتیت بدەم بە تەنیا ئەو کارەت پێ ئەنجام نادرێت.
مێرووله ڕەشەکە گوتی:
پێم وتیت پێویستم بە یارمەتی تۆ نییە، ئەزانم بۆچی خۆت هەڵگرتووە؟
بە نیازیت بەشیبکەیت لەگەڵم، برۆ بەڕێی خۆتەوە، ئەوە بەچاو نابینی.
لەو کاتە کە ئەو دوو مێروولەیە لەو قسانە بوون، کەڵەشێرێکی ڕەنگاوڕەنگ پۆپیتە گەورە پەیدابوو دەگەڕا بەدوای چەند دەنکەگەنمێک، کە دەنکەگەنمە قەڵەوەکەی دی بە دەنوکێک ئاودیوی کرد.
لەو کاتە هەردوو مێروولەکە لە ترسی کەڵەشێرەکە هەریەکەیان بەلایەکدا تێیان تەقاند.
کەڵەشێرەکە کە دوورکەوتەوە، مێرووله سوورەکە خۆی گەیاندەوە لای مێرووله ڕەشەکە و پێی گوت:
دەبڕۆ بیخۆ، ئەوە ئەنجامی چاوچنۆکی تۆ بوو، وەک برا بۆ خۆمان بمانخواردایە لەوە باشتر نەبوو ئەو کەڵەشێرە بیخوات.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| بە هاناهاتن | بە دەنگەوە هاتن |
| تێیان تەقاند | خێرا ڕۆیشتن، ڕایانکرد |
| چاوچنۆک | چاوبرسی |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. مێرووڵەکە کە دەنکە گەنمەکەی دۆزییەوە، لە دڵی خۆیدا چی گوت؟

٢. مێرووڵەسورباوەکە چی بە مێرووڵە ڕەشەکە گوت؟

٣. کەڵەشێرەکە بەدوای چی دەگەڕا؟

٤. چ پەندو ئامۆژگاریەک لەم چیرۆکەوە فێربوویت؟

# کوردستان



کوردستانی خۆش، نیشتمانی جوان

تۆ قیبلەگاهی منی بێگومان

چاوم پشکووتووی شاخەکانتە

فێری سەیرانی باغەکانتە

دەنگی شمشاڵی شوانەکانت

زریق و باقی جوانەکانت

قاسپەی کەوانی قەد کێوەکانت

خوڕەی ئاوەکەی نشێوەکانت

ئەمانە هەمووی گوێیان کردمەوە

هەوێنی شیعری دڵیان گرتمەوە

من درەختێکم لەو خاکە ڕووام

بەخۆشەویستی تۆوە ئاودرام

( دڵدار* )

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| قیبلە | : | ڕوانگە / ڕووگە |
| پشکوتوو | : | کراوە / پشکڤی |
| زریق | : | دەنگی کۆمەڵی مەلان / جریوە |
| نشێوەکانت | : | نزمایییەکانت / نشیڤ |

---

* دڵدار: ناوی یونس کوری مەلا ڕەئوفە، ساڵی ١٩١٨ی زایینی لەشاری کۆیە لەدایک بووە، لە ساڵی ١٩٤٨، لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە.

# بەسەرهاتی گوڵێک



گوڵێک بەسەرهاتی خۆی بۆ شاعیرێک گێڕایەوە... گوتی: خونچەیەک بووم لە باخێک، ڕۆژانە لەژێر بارانی زستان و بەهاردا بە مۆسیقای هەورەکان سەمام دەکرد، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەورە دەبووم وگەشەم دەکرد. ئارەزووم لەوە بوو باڵەکانم بکەمەوە وجوانیی خۆم بە هەتاو و باڵندەکان پیشاندەم... ئای چەند خۆش بوو کە پشکووتم!! پەپوولەکان لێم ئالاَن، چۆلەکەکان بۆمیان دەجریواند بەڵام نەزانێک لەجیاتی ئەوەی بۆنم کات وتەماشای جوانییەکەم بکات، دەستی هێناو بە نینۆکە تیژەکانی لاسکەکەی قرتاندم وکۆتایی بەژیانم هێنا..!! دەبینیت نە بۆنم ماوە، نە بووم بەبەر. شاعیرەکەش خۆی پێنەگیرا و گوتی:

دەمەگری، مەگری گوڵی بەستەزمان
تۆش شەهیدێکی بێ ناوونیشان.

# واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| بەسەرهات | : سەربووردە |
| قرتاند | : پچڕاندن / قەتیاند |
| بەستەزمان | : هەژار / بەلەنگاز |

# ڕاهێنان

ئـ- وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. تا چەند لەو بڕوایەدایت، کە درەخت سەرچاوەی جوانیی سروشتە؟ بۆچی؟

٢. چ پەیوەندییەکە لەنێوان شاعیر وگوڵ وباڵندە هەیە؟

٣. بۆ دەبێت پارێزگاری لە درەخت و باخچەکان بکەین؟

ب- ناوی چەند گوڵێک بنووسە:

..............، ..............، ..............، ..............، ..............

**دارشتن:**

قوتابی خۆشەویست:

چەند دێرێک لەسەر بەسەرهاتێک بنووسە.

# حەپسەخانی نەقیب



مامۆستا جوان، لە جەژنی ئافرەتانی جیهاندا باسی حەپسەخانی نەقیبی بۆ کردین و گوتی:

حەپسەخان ئافرەتێکی ناوداری کورد بوو، لە ساڵی ١٨٩١ی زایینیدا لە شاری سولەیمانی لەدایک بووە. کچی شێخ مارفی نەقیب بوو لەمەلاو زاناکانی ئەو سەردەمە فێری خوێندەواری بووە، ئەم خانمە زانست پەروەرە، وەک ژنێکی کوردی ناودار لە ساڵی ١٩٢٩ز بەشداری لە کۆنگرەی نەهێشتنی نەخوێندەواری کردووە، لە ساڵی ١٩٣١ وەکو ژنە کوردێک نامەی بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان ناردووە و داوای مافی گەلی کوردی کردووە.

ئەم ژنە ناوادارە لە ڕۆژی ١٩٥٣/٤/١٢ لە شاری سلێمانی ماڵئاوایی لێکردین و هەر لە سلێمانی نێژراوە.

قوتابییان پێکەوە گوتیان: سڵاو لە گیانی پاکی ئەم دایکە دڵسۆز و زانستپەروەرە.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| ئافرەت | : ژن |
| ناودار | : بناقودەنگ |
| شار | : باژێڕ |
| کردەوە | : ڤەکر |
| پێکەوە | : پێکڤە ، بهەڤڕا |

## ڕاهێنان (١)

ئەم بۆشاییانە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. حەپسەخانی نەقیب لە ساڵی ............ لە شاری ............ لە دایک بووە.

٢. حەپسەخان ............ بوو.

٣. ئەم ژنە ناوداره لە ڕۆژی ............ لە شاری ............ ، ماڵئاوایی کرد .

٤. سلاو لە گیانی پاکی ئەم دایکە ............ و ............ .

## ڕاهێنان (٢)

نیشانەی ڕاست یان هەڵە بۆ ئەم ڕستانەی خوارەوە دابنێ:

١. حەپسەخانی نەقیب ئافرەتێکی ڕۆشنبیر و زانستپەروەر بوو.

٢. حەپسەخانی نەقیب لە ساڵی ١٩٣١ نامەی بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان ناردووە.

٣. حەپسەخانی نەقیب لە ساڵی ١٩٤٠ بەشداری لە کۆنگرەی نەهێشتنی نەخوێندەواری کردووە .

## چالاکی (١)

بە هێڵێک وشە لەگەڵ یەک گونجاوەکان بگەیەنە یەک:

| | |
|---|---|
| خوێندن | کارگە |
| کارکردن | قوتابخانە |
| چارەسەرکردنی نەخۆش | مەلەوانگە |
| فرۆشتنی دەرمان | گەرماو |
| نانخواردن | یاریگە |
| خۆشوشتن | نەخۆشخانە |
| یاریکردن | دەرمانخانە |
| مەلەوانی | خواردنگە |

## چالاکی (٢)

زانست      زانستپەروەر

تۆش ئەمانەی خوارەوە وەکو نموونەی سەرەوە لێبکە:

نیشتمان ←

کـــورد ←

هونـــەر ←

وڵات ←

مـــاف ←

## چالاکی (٣)

جوان ← جوانتر ← جوانترین

تۆش ئەم وشانە وەک ئەوانەی سەرەوە لێبکە:

شیرین ← ............ ← ............

ترش ← ............ ← ............

ئازا ← ............ ← ............

خۆش ← ............ ← ............

مزر ← ............ ← ............

خێرا ← ............ ← ............

کورت ← ............ ← ............

درێژ ← ............ ← ............

## چالاکی (٤)

قوتابی خۆشەویست باسێک لەسەر یەکێک لە ئافرەتە ناودارەکانی کورد بنووسە.

# ئاشتی



ل سەر چیا
پێلێن دەریا
لێڤێن رویبار وکانیا
ل سەر دلا
بەلگێن گولا
پەڕێن شالیل وبلبلا
ل سەر رویێ ڤیانێ
ل سەر دلێ ژیانێ
دێ تەڤنەکێ سپی رێسم
ب ئاوازا نڤێسم
پەیاما کوردستانێ
ئاشتی بۆ تەڤ جیهانێ

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| هێلی دەریا | : | شەپۆلی دەریا |
| لێڤی | : | لێوار |
| بەلگێن گولا | : | گەڵای گوڵ |
| شالیل | : | جۆرێکە لە باڵندە |
| تەڤنی | : | تەون |
| تەڤ | : | هەم |

# پێرست